

چاپی یەکەم



رۆمان

# بەفرانبار و کۆتایی خەونەکان


ئەسیر عەبدوڵلا نەشمی

عیسا عوسمان

لە عەرەبییەوە کردوویە بە کوردی

# بەفرانبار و
# کۆتایی خەونەکان

## ئەسیر عەبدوڵڵا نەشمی




عیسا عوسمان
لە عەرەبییەوە کردوویە بە کوردی




لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان
بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەممەد

**ناسنامەی کتێب**

ناونیشان: بەفرانبار و کۆتایی خەونەکان
نووسەر: نەسیر عەبدوڵڵا نەشمی
بابەت: ئەدەبیاتی عەرەبی – سەدەی ٢١م
ژانر: ڕۆمان
وەرگێڕانی: عیسا عوسمان
پێداچوونەوە: کەیوان هەورامی
دیزاینی دەق: ئارام مەلا محەمەد
دیزاینی بەرگ: عیسا عوسمان
بەخشانگە: ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان
ساڵی چاپ: ٢٠٢٣ میلادی، چاپی یەکەم.

**پەیوەندی:**
07731974646 - 07501571818
bookadiban@gmail.com

**ناونیشان:**
نووسینگەی سەرەکی: سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا، فولکەی گوزەکان، سەرووی ئامادەیی سلێمانیی کچان، نزیک ناوەندی ڕۆژهەڵاتی کوڕان.

**پێشکەش بە**

ئێوە...

*هەرگیز لە باڵندەیەکی لانەواز مەپرسن، کە بۆ هەڵفڕی!...*

**فارووق جەویدە**

دەروازە

«نووسەر لە ڕێی ڕۆمانەوە، لە چیرۆکی دڵخوازی خۆیدا دەژییتەوە و ئەو کەسەش بە نەمری دەهێڵێتەوە کە خۆشی ویستووە.»

– ئەحلام موستەغانمی

ئەم ئافرەتە سەراسیمەی کردووم. شپرزەیی ژیانی و هەستە سەرشێتانەکانی تاساندوومیان. «هیچ شتێکیش» ئەو بە شتێک، یاخود کەسێکەوە نابەستێتەوە! نازانم هەر ئەمەیە منی وابەستەی ئەو کردووە یان چی، ئەوەندە دەزانم کە ئافرەتێکی کەموێنەیە، لە «قوڕێک» ئافرێنراوە کە لە هی هیچ بەنیئادەمێک ناچێ و هەر ئەمەش منی سەرسام کردووە، بگرە زۆریش سەرسامی کردووم. مەیلی ئەزموونێک دەکەم کە لە هیچ ئەزموونێکی تر ناچێ، چارەنووسێک کە فرێ بە هیچ چارەنووسێکی ترەوە نییە، ئافرەتێک کە بێ ترس، چاونەترسانە قوماری لەسەر بکەم.

هەست دەکەم لەگەڵیدا سەرچڵیی زۆر دەکەم. گرەو لەسەر شتێکی نادیار دەکەم و جگە لە باوەڕێکی نهێنی کە پێم دەڵێ مەتەڵگەلێکی ئاسمانیی زۆری لە خۆ گرتووە، هیچ شتێکی تر بەوەوە نامبەستێتەوە. خۆ دەزانم هەوڵەکانم بۆ هەڵهێنانی ئەم مەتەڵانە بێهوودە دەبن و وەڵامی پرسیارەکان هەر وا بە نادیاری دەمێننەوە، بەڵام دەبێ بڵێم کە سەوداسەری ئەم هەموو وەڵام و مەتەڵهەڵهێنانە نیم. پێویست ناکات دەرک بە بەهای ئەو بکەم، چونکە لە هەموو شتێکی تێدەگەم و هیچیشی لەبارەوە نازانم.

لام گرنگ نییە کێیە و کێ نییە و بە کوێ دەگەین، هێندەم گەرەکە وەک پەرستنێک لێی بڕوانم، وەک یاسا و ئایین و هێڵێکی سوور لە

ژیانمدا بمێنێتەوە! بەڵام ئەو، پابەندی هیچ یەک لەمانە نییە، بڕوای بە کۆسپومۆسپ نییە.

بیرمە ڕۆژێکیان پێی وتم:

– یاسـاکان بۆ ئەوە دانراون، هەندێک پەیڕەویان بکەن و هەندێکی تریش بیانشکێنن.

جا منیش لێم پرسی:

– تۆ کامیانی؟

– من ئەسـڵەن ناچمە ژێر باری هیچ یاسـایەکەوە تا پەیڕەویی لێ بکەم، یاخود بیشکێنم. با بڵێین ئەوە من ناگرێتەوە!

ئەوکات خەندەیەکم کرد، چونکە دەمزانی کە ئافرەتێکی وا، لە گشت یاسایەک و سیستەمێک بەرییە کە حکمووڕانی بکات، لەولاشەوە ئایین پەلوپۆی نەبەستووە و تەنیا باوەڕی بە خۆی هەیە.

زۆرم پێ سـەیرە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ناومی نەپرسـی! زۆر لام سـەیرە کە منیش قەت زاتم نەکرد بڵێم ناوت چییە، وەک بڵێیت لە ناو بترسـین، وەک ئەوەی ناو ئاماژە بەو جەوهەرەمان بدات کە هەرگیز نامانەوێ حەقیقەتەکەی بزانین. هەردووکمان لەسـەر ئەوە کۆکین کە ئەوی تر بە نهێنییەکانییەوە جوان بێت و نامۆییەکەی سەرنج بکێشێت. هەردووکمان عاشـقی ئەم یارییەین، بەم شـەیدایی و عیشـق و ئـارەزووەوە، تـا سـەرئێسـقـان نغرۆی یەک بووین. بێ ئەوەی جەوهەرێک هەبێ جیامان بکاتەوە، یاسایەک کە فەرمانڕەواییمان بکات و ناوێک کە پێی بناسرێینەوە!

دەزانم شـتێک هەیە کە پێکەوەی گرێ داوین و پاش ئەو هەموو کاتە، ئێمەی لای یەک هێشـتووەتەوە. یاخیبوونێکی سـەرسـەختانە، شـێتییەکی بێراده، خەونگەلێکی قەدەغە و زمانێکی ڕچەشـکێن ئێمەی

کۆ کردووەتەوە. من و ئەو، تا خوا حەز بکات سەرشێت، توورە و بەلەسە، دوو مرۆڤی یاخیی بێسنوورین. سەرگەردانی شتێکین کە خۆشمان نازانین چییە، هەڵبەت بێ ئەوەی نەخشە، پلان، یاخود بیرۆکەیەکمان هەبێت!

ئاخر چۆن دەکرێت ئاوا عاشقی بم و هیچیشی لەبارەوە نەزانم! چۆن هیچی لەبارەوە نازانم، لە کاتێکدا لە ڕێی ئەوەوەیە کە هەموو شت دەزانم.

بۆ «جاروبار» بێئاگاییم لە ناو و تەمەن و شوێنی لەدایکبوون و پیشەکەی، نیگەرانم دەکا!؟

تۆ بڵێیت بێخەبەریی «ئەو» لە من، تا ڕادەیەک وەک بێهەواڵیی «من» لە «ئەو»، کاریگەریی جێ هێشتبێت! ڕاستییەکەی سەری لێ دەرناکەم، بەڵام دەزانم کە وەک یەک نین، دەزانم کە ئەوە سۆسەکانن کۆمان دەکەنەوە و هەقیقەت لای ئێمە جێی نابێتەوە.

من هەر وای بۆ دەچم کە لە خاکێکی دوورەوە هەڵهاتبێت، خاکێکی دڵڕەق کە ئەم خانمەی وا «یاخی» کردووە، بەڵام زمانە بێئەندازە «سپییە»[1] عەرەبییەکەی، ناچێتەوە سەر هیچ شوێنێک.

سیمای «هەمیشە»گۆڕاوی، هی تەمەنێکی دیاریکراو نییە! هەموو جار کە چاوم پێی دەکەوێت، سەرم لە سیمای سووڕ دەمێنێ و دەڵێیت یەکەم جارمە دەیبینم. هەر لایەکی ڕوخساری بە نموونە وەربگریت، تەمەنێکی هەیە، هەر زەردەخەنەیەکی تایبەتمەندییەک و هەر نیگایەکیشی چیرۆکێک! نازانم لە سییەکاندایە، یان ئەوەتا ساڵانی

---

١. زمانی سپی، یاخود شێوەزاری سپی، شێوازێکی قسەکردنە کە ئاخێوەر بەزۆری پشت بە زمانی دایکی دەبەستێت، بەڵام لە پاڵ ئەمەشدا چەند شێوەزارێک تێکەڵ دەکات و لێرە و لەوێش وشەی بێگانە بەکار دەهێنێت. «و. ک»

چلی تەمەنی لەشـــــاغانە دەگوزەرێنێت! ئیدی تا ئاماژەی دواتر، تەمەنی هەر وا لە سۆسەکانمدا بە نەزانراوی دەمێنێتەوە.

***

وام دەزانی بۆ نووسین ئافرێنراوین، چونکە نووسینی لێ دەرچێت، باکم بە هیچ شتێکی تر نەبوو. دایمەی خوا مەراقی پیتەکان لە کەللەمدا بوو، چونکە لای من نووسین لە پێداویستییە سەرەکییەکانە. خولیایەک نەبوو کە لە کاتە بەتاڵەکانمدا خووی بدەمێ، بەڵکە لەو ئارەزووە بەتینانە بوو کە ســەرباری چێژیش، بڕســتمان لێ دەبڕن و ناتوانین بەریان پێ بگرین، یاخود جڵەویان بکەین.

هەردەم پێم وا بوو، سەرم بەدیار کاغەز و قەڵەمەوە سپی دەکەم، لام وا بوو دەزانم چارەنووســم بە کوێ دەبڕێت و تەنیا پیتەکان خەفەتم بۆ دەخۆن، بەڵام کە ئەو هات، چیتر مەرگ بێزاری نەدەکردم، چیتر پیتەکان تینوویەتییان نەدەشــکاندم و بیرم لەوە نەدەکردەوە کە چی لە پشت مەرگ و وشە و شتەکانی ترەوە خۆی حەشار داوە.

بە ڕای من، کە ئەو دێتە گۆ، فەیلەسووفەکان شکست دێنن، زاناکان ســەریان لێ دەشێوێت، شــاعیران زمانیان دەکەوێتە تەتەڵە و هەموو مرۆڤێکی مەزن جگە لە ئەو، تێک دەشکێت. ئەو ساتانەی کە لای ئەوم، هەست دەکەم جیهانم داگیر کردووە و هی منە! هەست دەکەم دەتوانم دەســت بەســەر هەموو شــتێکدا بگرم! شــێتوشــووریکی وەک منیش، هــیوایەتــی زاڵبوون، دەســـەڵات، جڵەوگرتــن، تــونــدوتیــژی و... دەســتبەســەرداگرتنە! ئەو جێگرەوەی هەموو ئافرێنراوان و جیهانە بۆ من، هەر لەبەر ئەوەشە کە بە تەواوی بوونمەوە بۆ خۆمم برد، چونکە بێکۆتایە، ئافرەتێکە کە ئەوسەری دیار نییە.

گەر دەتزانی چەنێک هۆگریم! چەنێــک عــاشــقی یەک بە یەکی بارەکانیم! لە بەردەم ئەودا، ڕووتوقووت دەبمەوە، هەر ئەویشـــە بە

چەشنێک کە هیچ بوونەوەرێک نەتوانێت بەری بگرێت، وەک خۆرێکی بەتین هەڵدێت. ئافرەتێکە تەنیا هێزێکی خودایی سەرووئاسایی دەتوانێت بەری پێ بگرێ، ئافرەتێکە تەنانەت دەتوانێ سنووری ئاسمانیش تێبپەڕێنێت، بەڵام ئەو کاتانەی بیرم دەکات، دەگەڕێتەوە و بێ ئەوەی توسقاڵێک هەست بە تاوان بکات، سەر دەخاتە سەرم و پێم ڕادەبوێرێت.

تێکەڵەیەکی چێژبەخشە، هاوزەمان پێکهاتەیەکی سەیر و سەرنجڕاکێش. بەیانیان کە خۆی لێم ڕادەپسکێنێ و لە جێخەوەکە دەچێتە دەر تا خێرا خۆی بشوات و دوای شەوێکی دووردرێژ لە چێژی قەدەغە نوێژ بکات، تەماشای دەکەم. یەکسەری نوێژ دادەبەستێ، وەک بڵێیت هیچ شتێک نەتوانێ ئەو لە خودا دوور بخاتەوە. جا دەگەڕێتەوە لام، تا بە جۆرێکی تر بەردەوامی بە پەرستنەکەی بدات. پەرستنێک کە ئەم جارەیان، من تێیدا دەبمە خودا و یاسادانەر.

هەمیشە هەست دەکەم کە ئەو دەزانێت چۆن بە خودا بگات، چونکە جارێکیان بە سەرخۆشی پێی گوتم کە ئێمە داوای ڕێنوێنی لە خودا ناکەین، بەڵکە خودا دەکەینە ڕێنوێن. تا هەنووکەش، نازانم کە چۆن ئافرەتێکی زۆر مەست، دەتوانێت فەرموودەی قوودسی بهێنێتەوە!

مەراقمە لە میراتە نائەقڵانییەکەی تێبگەم، دەرک بە پاشخانی دژیەکییە نەبڕاوەکانی بکەم و، شەهوەتەکانمی لەگەڵدا بەش بکەم، هەموو جۆرە شەهوەتێک! وەک چۆن ملکەچیکردنی خوداکەی سەرنجم ڕادەکێشێت، ئەو خودایەی کە لەمێژە پەیوەندیم لەگەڵیدا پچڕاوە.

لەوەتەی ناسیومە، تەنیا و تەنیا ترسی لەدەستدانیم هەیە. دەترسێم وەک چۆن کتوپڕ دەر کەوت، ئەوهاش لەناکاو شوێنبزر بێت و هەر

بەو جۆرەی کە لە نادیارییەوە سەری دەرهێنا، بە هەمان شێوە بچێتەوە باوەشی!

ڕەنگە خۆیشی نەزانی کە چەند پرسیاری لا وروژاندووم! باکم بە ڕابردووی نییە. ئەسڵەن گوێم لێ نییە لەگەڵ چەند پیاودا بووە و دڵی بۆ چەند کەس لێی داوە. بەڵام زەندەقم لەوە چووە کە مێردی هەبێت! ئەم فکرە تۆقاندوومی، نەشتوانم لێی بپرسم، چونکە ڕێک کەوتین (بێ ئەوەی ڕێککەوتنێکیش لە ئارادا بێت) کە هەموو ڕاستییەکان هەر وا بە نەزانراوی بهێڵینەوە. خۆمان بدەینە دەست هەڵکەوتەکانی چارەنووس و بێ ناو و نیشان، عاشقی یەک بین. بەڵام ئافرەتێکی یاخیی وەک ئەو، چاوەڕێی هەموو شتێکی لێ دەکرێت! ئافرەتێکە لە ئێستەدا ناسرەوێت. دەکرێ لە هەر ئانوساتێکدا بێت بڕوا و نەگەڕێتەوە. کەسانی وەک منیش ناتوانن ببنە کۆسپی بەردەم ڕۆیشتنی.

جارێکیان کە هەندێک پرسیارم لێ کرد، لەپڕ بزر بوو! بە جێهێشتن سزای دام. لە هەموو جێیەک بۆی دەگەڕام. لە هەرچی کونوقوژبنە وێڵی ئافرەتێک بووم کە نە ناوی هەیە، نە نیشان. چەندان هەفتە هەر وا سەرگەردانی بووم و ئەوی لێ دەرچێت، دەستم لە هەموو شتێک شتەوە. لەو کاتەدا هەستم کرد لووتبەرزیم خەریکە نامێنێت و هیچ لاشم گرنگ نەبوو، چونکە ئەوکات جگە لە دۆزینەوەی ئەو، باکم بە هیچ شتێکی تر نەبوو.

ئەو کاتەم بیرە کە پاش ماوەیەکی درێژی دابڕان، سەرنجم لەسەری گیرسایەوە. بینیم لە یەکێک لەو قاوەخانە کراوانەی کە بۆ ژوان سەردانمان دەکردن، دانیشتووە. بە هێمنییەکی هەژێنەرەوە

جگەرە دەکێشێت، کوپێک قاوە و کتێبێک کە وێنەی ڤۆڵتێری[1] لەسەر نەخشێنرابوو، لە بەردەمیدا بوون و چاوەکانیشی بەخنشدانە بە ئاراستەی من نیگایان دەکرد.

بەدەم نزیکبوونەوەوە بەرەبەرە دەکەوتمە هەناسەبڕکێ، وەلێ نەمویرا هیچ بڵێم، بارەکانی ڕوخساریم پشکنین تا بزانم هەروەک خۆیەتی یان نا. هەرچەند سەرنجەکانی ئاڵۆزتر بوون، بەڵام هەر دەتگوت دوێشەو جێی هێشتووم.

لە کاتێکدا کە دەزوولەیەک دووکەڵ لە بەینی لێوەکانییەوە دزەی دەکردە دەرێ، پێی گوتم:

– هێشتاش پرسیارت هەیە؟!

توند قۆڵیم گرت و بە گوێیمدا چپاند: «با بڕۆین!»

لەگەڵم هات! سووکوئاسان سوار سەیارەکەم بوو، وەلێ بە درێژایی ڕێگە هیچمان نەگوت. بە تووڕەییەوە سەیری کتێبەکەی ڤۆڵتێرم دەکرد کە لە کۆشیدا نوستبوو. بیرکردنەوە و زیرەکییەکی وای نەدەویست تا تێبگەم کە کتێبەکەی بۆ من هێناوە، چونکە خۆی حەزی لە ڤۆڵتێر نییە و بەس بۆ منی دەخوێنێتەوە. وای زانیوە دەتوانێت بەمە ئاشتم بکاتەوە. ئەو ڕۆژە خوێنم بۆ ڤۆڵتێر کوڵابوو! قینم لێی هەستابوو، چونکە پێی وا بووە دەکرێت ڤۆڵتێر بۆشایی ئەو چەند ڕۆژە دوورییەی لە من بۆ پڕ بکاتەوە!

بۆ شەوەکەی، توند بووم لەگەڵی، بەس لۆمەم نەکرد، چوون دەترسام جێم بهێڵێتەوە. ئەویش نەیپرسی کە بۆ وا توندم لەگەڵی،

---

١. Voltaire (١٦٩٤-١٧٧٨): فرانسوا ماری ڕووناکبیر، نووسەر، مێژوونووس، فەیلەسووفێکی فەرەنسی بووە. ڤۆڵتێر بە ڕەخنەکانی لە مەسیحییەت، ئازادیی ڕادەربڕین، ئازادیی ئایین و جیاکردنەوەی ئایین لە دەسەڵات ناوبانگی دەرکرد. «و. ک»

ڕەنگە خۆی هۆکارەکەی زانیبێت! زۆر دەترســـام، چونکە دەمزانی کە بە ئەندازەی دوو کەوان، یان کەمتریش، لە دیارنەمانییەوە دوورم!

پاش چەند ڕۆژێک لێم پرسی:

– چۆن شتێکی وا دەکەی؟ چۆن لەپڕ ون دەبی و دەر دەکەویتەوە؟

بە گاڵتەوە گوتی:

– بە جادوگەر تێم گەیشتووی؟

– بۆچی بە پرسیار وەڵامی پرسیار دەدەیتەوە؟

– ئەی بۆ مەگەر ڤۆڵتێر ناڵێ کە دەبێ لە ڕێی پرســـیارەکانەوە بڕیار لەسەر کەسەکان بدەین نەک وەڵامەکانیان؟

– بۆ تۆ وا بیرت دەکردەوە من لە ڕێی وەڵامەکـانتەوە بڕیـارت لەسەر دەدەم؟

– کەوایە بۆ هێندە پرسیار دەکەی؟

– چونکە خەریکە گومان لە بوونت دەکەم! بڕوات هەبێ، لە ڕاستی و ناڕاستیی بوونت کەوتوومەتە گومانەوە.

– گومان لە شتێ دەکەی کە بەرهەستی دەکەی؟

– نازانم، تۆ هاوکار بە و لەم گومانە دەرم بێنە.

– ئەی تۆش وەک هاوڕێ فەیلەســـووفەکانت بڕوات بەوە نییە کە هۆکاری شڵەژان و دوودڵیت، سووربوونتە لەسەر زانینی شتەکان؟

– تۆ بڕوات بە چی هەیە؟

– بڕوام وایە کە یەقین تەنیا درۆیەکە! شـــتێک بە ناوی هەقیقەتی پشـــتڕاســـتکراوە لەم ژیانەدا بوونی نییە، گومان لە بوونی هەموو شتەکانی دەوروبەرمان دەکرێ.

– تەنانەت تۆیش؟

– تەنانەت تۆیش!

بە گاڵتەوە گوتم:

– بەڵام تۆ بە گشت هەستەکانت، هەستم پێ دەکەی!

– قەت وشەی وەهمت نەبیستووە؟

توند لە ئامێزم گرت و دەستەکانم جەستەییان دەپشکنی:

– تۆ ڕاستەقینەی؟

– ئەی تۆ ڕاستەقینەی؟

– دەزانی لە پرسیارکردندا دەستێکی باڵات هەیە؟

– ئەی تۆش دەزانی کە من توانای وەڵامدانەوەی هیچ پرسیارێکم نییە؟

– تەنیا وەڵامی یەک پرسیارم بدەوە، جیا لەوە هەر پرسیارێکی ترم کرد خۆتی لێ نەبان کە.

– ناتوانم وەڵامی پرسیارەکانت بدەمەوە!

– ناتەوێ سەرەتا بزانی پرسیارەکەم چییە؟

– وا دەزانی نایزانم؟

– ئەی تۆ چی؟ ناتەوێ وەڵامی پرسیارێکت بدەمەوە؟

– جا وەڵامم دەدەیتەوە؟

– پێم وایە بەڵێ!

– پێم وا نییە بوێری!

سەرم خستە سەر سینەی و گوتم:

– جەستەت بۆنی هۆنراوەی لێ دێ!

– بۆ مەگەر هۆنراوەیش بۆنی هەیە؟

– تەنیا هۆنەران دەتوانن بۆنی هۆنراوە بکەن.

– تۆیش یەکێکی لەوان؟

– من قەڵەمم، تەنیا قەڵەمێک و بەس! ئەی تۆ؟

– من چیرۆکێکم!

– لەگەڵ من قەت واز لە یاریکردن بە وشە ناهێنی وایە؟

– تۆ واز بێنە.

سەریم ماچ کرد و گوتم: گوێی مەدەرێ! بەم جۆرە خۆشم دەوێی! بەم هەموو نهێنی و مەتەڵانەتەوە!

بە بێدەنگی خەندەیەکی کرد و منیش وەک چیرۆکێکی کتێبی هەزار و یەک شەو دەمبینی! یان چیرۆکێک کە *بەیدەبا* بە تایبەت بۆ *دەبشلیمی*[1] هەڵگرتبێت و جگە لە من کەسی تر چاوی پێی نەکەوتبێت.

***

ئەم جارەیان دیارنەمانەکەی درێژەی کێشا.

بەڵام نە دەمەوێ بیر لە هۆکارەکانی ڕۆیشتنی بکەمەوە، نە لە وادەی هاتنەوەشی. ئەسڵەن بیر لەوە ناکەمەوە کە لە بنەڕەتدا گەڕانەوەیەک بوونی هەیە یان نا، هێندە دەزانم هەرچۆنێک بێت، هۆکاری خۆی هەیە! کۆمەڵێک هۆکار کە پێدەچێ هەرگیز نەیانزانم.

---

١. دەبشەلیم پاشایەکی کۆنی هیند بووە کە بەیدەبای فەیلەسووف ڕادەسپێرێ تا کتێبێکی پڕ لە پەند و حیکمەت و ئامۆژگاری بنووسێت. «و. ک»

دەمەوێ خووی ئەو بگرم و بەمەش قەرەبووی دوورییەکەی بکەمەوە، منێک کە هەرگیز خووی کەسم نەگرتووە، کەچی ئەوەتا هی ئەوم گرتووە، وەک بڵێیت بمەوێ بەم کارەم هانی گەڕانەوەی بدەم. وام لێ هاتووە هەموو بەیانییەک بە دەنگی سازی *سیتا هاکوبیان*[1] خەبەرم دەبێتەوە و بە هی خەمهێنی *سەعدوون جابریش*[2] خەو دەمباتەوە. نازانم چ شتێک ئەم دووانە بەیەکەوە دەبەستێتەوە و، بۆچی ئەو هێندە پێویستی پێیانە.

ڕەنگە گەر بڵێم وەک ئەوم لێ هاتووە و، لە هەموو شتێکدا لەو دەچم، بڕوام پێ نەکا. ئێستە بۆ ناشتا[3]، چەند دەنکێ توووترک و کوپێک شیر دەخۆمەوە، ژەمەکانی تریش جگە لە سەوزەی کوڵاو هیچی تر ناخۆم و جیا لەمەش، دەم لە خۆراکێکەوە نادەم کە بە زەیتی زەیتوون لێنەنرابێ، بەڵام هێشتاش هەر وەک ئەوم، هەر وا فیشکەی جگەرەم دێت و هەموو شەوێک پێش خەوتن، بوتڵێک شەراب دەخۆمەوە! دەمەوێت لەم شێتی و دژیەکییە تێبگەم کە ئەوی تێدا دەژی و منیشی پەلکێشی ناوی کردووە!

---

١. سیتا هاکوبیان: گۆرانیبێژێکی عێراقی بە ڕەچەڵەک ئەرمینییە، لە ساڵی ١٩٥٠ لە بەسرە هاتووەتە دونیاوە. ساڵی ١٩٦٨ دەستی بە گۆرانیگوتن کردووە، تا وای لێ هاتووە بە «فەیرووزی عێراق» ناسراوە. «و. ک»

٢. سەعدوون جابر: ساڵی ١٩٥٠ لە میسان لە دایک بووە. سەرەتا کە چووەتە دونیای هونەر و گۆرانیبێژی، بە عەبدولحەلیم حافز سەرسام بووە. ساڵانی ١٩٨٦ تا ١٩٩٠ گرنگترین قۆناغی تەمەنی سەعدوون جابر بوون. لەو ساڵانەدا بە مەبەستی خوێندن دەچێتە لەندەن و دواتریش بۆ خوێندنی دکتۆرا ڕوو لە وڵاتی میسر دەکات. جیا لە گۆرانی، لە نواندنیشدا لێهاتوو بووە و لە زنجیرەیەکدا کە سەبارەت بە ژیانی نازم غەزالی بووە، بەشدار بووە. «و. ک»

٣. ناشتا: نانی سەرلەبەیانی، بەرچایی. «و. ک»

بەڕێوەبەری تەحریر «بە تـایبەت» پەیوەنـدیی پێوە کردم. «یانی پیرەمێردێکە کە گەر ئەو نەبووایە، ئەم پیاوەی ئێستە نەدەبووم! ئەو پیاوە نەدەبووم کە -هەر وا بە ئاسانی- ئەو پشتگوێ بخات».

زۆر تووڕە گوتی:

– ئەوە چیتە کاکە! گەڕاویتەتەوە بۆ ژیانی *سەعالیکەکان*[1]؟

– من هەردەم سەعلووک بووم گەورەم.

– ئەم گەورەیە چییە پێتەوە لکاند؟ مەگەر تۆ نەبووی دایم دەتگوت گەورەم نییە!

– بڕوات هەبێ جیهاد، گەر گەورەیەکم هەبێ ئەوا تۆی.

بە دەنگێکی ڕاڕاوە گوتی:

– چیتە هوزام؟ لە سەرەمەرگدای؟

– سـەرەتا تۆ تێم گەیەنە، بۆچی پەیوەندیت بە سـەعلووکێکی وەک منەوە کرد؟

– نیگەرانم کە لە نووسـین دابڕاوی. لەپڕ قەڵەمجافەکەت وشـکی کرد.

– بگرە خوێنم وشکی کردووە جیهاد!

---

١. سـەعالیک یاخود سـەعلووک، دەسـتەیەک بوون کە پێش ئیسـلام ژیاون و جووڵانەوە و کار و چالاکییەکانی خۆیان لە دورگەی عەرەبیدا ڕاگەیاندووە. زۆربەی هەرەزۆریان سـەر بە خێڵ یاخود هۆزێک بوون، بەڵام هیچ وابەسـتەیی و پابەندییەکیان بۆ هۆزەکەیان نەبووە و لێی جیا بوونەتەوە، بەم جۆرە دەرکراوانی هۆزەکان یەکیان گرتووە و کۆمەڵەیەکیان بە ناوی سەعالیکەکان دروست کردووە، هاوکات زۆربەی ئەندامەکانیشیان شـاعیری مەزنی سـەردەمی خۆیان بوون. «و. ک»

– نیگەرانت بووم کاکە! با کاتژمێرێکی تر لە قاوەخانەی بەرانبەر بینای جەریدەکە یەک ببینین!

– لەوێ دەبم.

ڕۆیشـــتم. بینیم چاوەڕێمە. وەک خووی هەمیشـــەیی خۆی کە تووشی دڵەڕاوکێ دەبێت، خێرا خێرا پێی بە زەویدا دەکوتی.

بە دەنگێکی گڕ پێی گوتم:

– قسەم بۆ بکە نەفرەتی! چی بووە؟

جگەرەیەکم بۆ ڕاداشت و پرسیم:

– تۆ بەس پێم بڵێ، هاوسەرەکەت چۆن بەرگەی ئەم زمانە زبرەت دەگرێ؟

– نازانم، هەست دەکەم ئافرەتان حەزیان لە زمانی زبر بێ!

منیش بە گاڵتەوە پێم گوت:

– مادلینیش حەزی لێیەتی؟

– بڕوات هەبێ، نـازانم ژنەکەم حەزی لە چییە و لە چی نییە. ئافرەتێکە کەس لێی تێناگا.

– هەست دەکەم هاوسەرگریکردن جۆرێکە لە باجدان جیهاد.

– هەرچۆنێک بێ! واز لە مـادلین بێنە و پێم بڵێ، یەکەم جـارە لەگەڵم باسی ئەوە بکەی ئافرەتان حەزیان لە چییە و لە چی نییە! چیت لێ قەوماوە برا! ئاخرییەکەی ئافرەتێک پێوەی کردی؟

– هەست دەکەم ئالوودەی بووم.

– ئەمە چ نەفرەتییەکە کە تۆی گیرۆدەی خۆی کردووە؟

– نـازانم جیهـاد! بڕوا بکە نـازانم! ئـافرەتێکە هەموو دنیـا دێنێ، پڕاوپڕە لە ژیان، بەڵام من هیچی لەبارەوە نازانم.

بە دۆشدامانەوە پرسیی:

– ناوی نازانی؟

– هیچی لەبارەوە نازانم!

– جا ئەمە دەچێتە ئەقڵەوە؟

– سەیرە ها؟

– ئاخر چۆن دەبێ؟

– دواندم، گوێم بۆ گرت، لەگەڵی نووستم. چەند ڕۆژێک لە خانووە زسـتانەییەکەمدا لەگەڵم مایەوە، بەڵام هیچ شـتێکی لەبارەوە نازانم جیهاد، ئەویش هیچ لەسـەر من نازانێ! بڕوا بکە هیچ لەبارەی یەکەوە نازانین.

– باشە ئەمە چ شێتییەکە؟

– بڵێ ئەمە چ چارەنووسێکە!

– ناچێتە ئەقڵەوە کە نەتناسـێ، تۆ بەناوبانگترین سـەرنووسـەری ڕۆژنامەی عەرەبیت، ئەمە چ گێژێکە کە ناتناسێ؟

– دەزانی چ شـتێ سـەیرە جیهاد؟ ئەو کاتانەی لەگەڵیم، بۆنی ئەدەب دەکەم. لە دەنگی نووسـاویدا، هۆنراوەی خنکـاو هەن، لە دەمارەکانی دەسـتیدا، وشـە دێت و دەڕوا. کە دێتە گۆ، ئاواز فوارە دەکا، کە بێدەنگیش دەبێ، وەک شـاژنێکی خۆبەزلزان بێدەنگ دەبێ! ئەم ئافرەتە زۆر سـەیرە جیهاد! ناچێتە ئەقڵەوە! دەزانی، هەندێ جار هەر بە ڕاسـتی گومان لە بوونی دەکەم، جارجارە خەیاڵ دەکەم کە

ئەمە وەهمێکە و خۆم سازم داوە. خەریکە شێت دەبم جیهاد! نازانم ئەم ئافرەتە هەر بە ڕاستی هەیە، یان زادەی خەیاڵەکانمە.

پیرەمێردەکە بە سەرنجەوە لیمی دەڕوانی، چەناگەی لەسەر لەپی دەستی گیرساندبووەوە، جا بێ ئەوەی چاو بترووسکێنێت، گوتی:

– ئەم ئافرەتە چ بەڵایەکی بەسەر هێناوی برا؟ یەکەم جارە بیبینم بلەرزی!

– دەترسم ڕاستەقینە نەبێ جیهاد! دەترسم هەمووی خەیاڵ بێ!

– تۆ سەبر کە برا! پێم بڵێ، ژمارەکەیت لایە؟

– هیچ لەبارەی کار و ژمارە و ناونیشانییەوە نازانم!

– ئەی چۆن یەک دەبینن؟

– بە هەڵکەوت! یان لە قاوەخانە، یان کتێبخانەیەکی عەرەبی، یانیش شانۆی *ئۆپێرا*. گەر بیری بکەم، لەم جێیانەدا بۆی دەگەڕێم، زۆربەی کاتیش لە یەکێکیاندا دەیدۆزمەوە.

پیرەمێردەکە لێم ورد بووەوە، جا بە هێمنی گوتی:

– هوزام! بۆچی سەردانی پزیشک ناکەی؟

– تکایە جیهاد! ئەم گاڵتانەم لەگەڵ مەکە! تۆش ئەوندەی تر مەمخە گومانەوە.

– برا، تۆ تەنیایی خنکاندووتی، نامۆیی سەختە، ئاسان نییە مرۆڤ بە تەنیا لە وڵاتێکی غەریبدا بێ!

بێدەنگ بوو، منیش بێدەنگ بووم، چون دەمزانی کەس بڕوام پێ ناکات. دەمزانی تا ئەو کاتەی پشتڕاست دەبێتەوە، یاخود وەک حەقیقەتێک دانی پێدا دەنێم، وەک وەهمێک دەمێنێتەوە.

***

ئەو مەتەڵێکە، مەتەڵێک کە کەس ناتوانێ هەڵی بهێنێ، بەلام عێراقییە و کەســـیش ناتوانێ ئەم بیرکردنەوەیەم بگۆڕێ، تەنانەت گەر هەوڵی شاردنەوەشی بدەم.

لەو شـــوقەیەدا کە بەکرێم گرتبوو تا تێیدا چاومان بە یەکدی بکەوێ، بۆ یەکەمین جار گوێم لە دەنگی ســـیتا هاکوبیان بوو و لێم پرسی کە خاوەنی ئەم دەنگە سازە کێیە، ئەویش گوتی گۆرانیبێژێکی کۆنی عێراقییە! لەسەر قەنەفەکە ڕاکشابووین و «خواردنەوە تایبەت و ســـەیر»ەکەی ئەومان دەخواردەوە: چای ئینگلیزی، کەمێک گوڵاو و کەوچکێکی بچووک زەنجەفیلی تێ کرابوو.

تەماشـــای یەکمان نەدەکرد، هەر یەکەمان هاوئاهەنگ لەگەڵ دەنگە ســـازەکەی ســـیتادا، خەیاڵی ڕۆیشـــتبوو. بە دەنگێکی خۆش، لەگەڵی کەوتە گورانیگوتن:

*منداڵ بووم و ئەویش هەر وا*

*بە نیگای چاو، ئاشنای عیشق بووین*

*گوتیان: سەیرکەن و بزانن*

*هەر لە منداڵییەوە تا گەورە دەبن، عاشقی یەک دەبن*

*وەک ئەستێرە و مانگ*

*عیشقەکەمان گەورە بوو و درەوشایەوە*

*بە چاوی تۆ ئەزیزم*

*ڕێگەی سەفەر دەگرینە بەر*

بەدەم تێفکرینەوە سەرم نایە سەر ڕانی. کە قسەمان دەکرد، بە عەرەبییەکی کەم تا زۆر پاراو دەدواین، بەڵام کاتێک یاخی، تووڕە، یان دەچووینە جێگە، وشەکان بە ئینگلیزی دەردەبڕران، وەک بڵێیت لە یاخیبوونەکاندا خۆمان لە عەرەببوون داماڵین! زۆر کات بە *نەجیدیتی*[1] دەدوێم، بەڵام ئەو بە شێوەزاری سپی، ئینگلیزی، یاخود زمانێکی سپی کە هی هیچ جێیەک نییە، وەڵام دەداتەوە. وەلێ من لە هەناسەکانیدا هەست بە *بابل* دەکەم، بۆنی *سۆمەری* لێ دێ، لە چاوەکانیدا *ئاکاد* دەبینم و لە لیکیدا تامی *ئاشوور* دەکەم.

هەموو ئەمانە تەنیا خەمڵاندن بوون، تەنیا خەمڵاندن، بەڵام وردە وردە لام ڕوون دەبوونەوە. وا ڕاهاتبوو لە «شوقەکەمان»دا دەنگی *سیتا هاکوبیان*، *لەمیعە تۆفیق*،[2] *زهوور حسێن*[3]، *سەعدوون جابر*، *نازم غەزالی* و *ئیسماعیل فەرووجی*[4] بێت. ئەو کتێبخانەیەی کە لە کتێبی

---

١. نەجدی: شێوەزارێکی عەرەبییە کە لە هەرێمی نەجددا باوە. ئەم شێوازە بە درێژایی مێژوو لەژێر فەرمانڕەوایی عەرەبدا ماوەتەوە و هەر لەبەر ئەمەشە کە پاراوی و ڕەسەنیی خۆی پاراستووە و بە یەکێک لە پوختترین و ڕەسەنترین شێوەزارە عەرەبییەکان دادەنرێت، ئاخر زۆربەی دەنگ و یاساکانی زمانی عەرەبیی «پاراو-فەسیح»ی لەخۆ گرتووە. «و. ک»

٢. لەمیعە تۆفیق (١٩٣٧-١٩٩٢): خانمەگۆرانیبێژێکی عێراقی بووە. لە شاری بەغداد لە دایک بووە، بەڵام خێزانەکەی ئەسڵ خەڵکی عەمارە بوون و دواتریش ڕۆیشتوونەتە بەغداد. لەمیعە لە دیارترین گۆرانیبێژانی ئەوکاتی عێراق بووە و بە شێوەگۆی بەغدادی گۆرانیی گوتووە. «و. ک»

٣. زهور حسەین (١٩١٨-١٩٦٤).

٤. ئسماعیل فەرووجی: گۆرانیبێژ و ئاوازدانەرێکی عێراقییە، ساڵی ١٩٦٣ لە بەغداد هاتووەتە دونیاوە. «و. ک»

ئاخنیبوو، پڕ بوو لە دیوانی سیاب[1]، عەبدولوەهاب بەیاتی[2]، مەعرووف ڕەسافی[3]، لەمیعە عەباس عمارە[4]، نازک مەلائیکە[5]، بلند حەیدەری[6]،

---

١. بەدر شاکر سیاب (١٩٢٦-١٩٦٤): لە گوندی جەیکووری پارێزگای بەسرە لە دایک بووە. لە گرنگترین شاعیرانی عێراق و نیشتمانی عەرەبی و ڕابەرانی شیعری ئازاد بووە. «و. ک»

٦. عەبدلوەهاب بەیاتی (١٩٢٦-١٩٩٩): هەروەک سیاب، لە ڕابەرانی شیعری ئازاد و گرنگترین شاعیر و ئەدیبەکانی عێراق بووە. لە بواری پەروەردە و ڕۆژنامەوانیدا کاری کردووە و بەردەوام لەنێوان عێراق، کوەیت، بەحرەین، سووریا، بەیرووت، قاهیرە، ئیسپانیا، ئوردن و ئەمریکادا گەشتی کردووە. «و. ک»

٧. مەعرووف ڕەسافی (١٨٧٥-١٩٤٥): مەعرووف ڕەسافی شاعیرێکی عێراقی بووە، لە بەغداد چاوی بە دونیادا هەڵهێناوە، باوکی کورد بووە و دایکی عەرەب. بنەچەی خێزانەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هۆزێکی کوردی بە ڕیشە عەلەوی. لە لادێیەکی نێوان پارێزگاکانی سلێمانی و کەرکووکدا ژیاوە. «و. ک»

٢. لەمیعە عەباس عمارە (١٩٢٩-٢٠٢١): خانمە شاعیرێکی عێراقیی نوێخواز و لە ڕابەرانی شیعری هاوچەرخی عێراقی بووە. لە سەردەمی حکومڕانیی سەدام حوسێندا نیشتمان جێ دەهێڵێت، لە ئەمریکا نیشتەجێ دەبێت و هەر لەوێش کۆچی دوایی دەکات. «و. ک»

٢. نازک مەلائیکە (١٩٢٣-٢٠٠٧): خانمە شاعیرێکی عێراقییە، لە کەشێکی ڕۆشنبیریدا گەورە بووە. دەرچووی خانەی باڵای مامۆستایان بووە لە ساڵی ١٩٤٤دا. دایکی شاعیر بووە و باوکی نووسەر. ساڵی ١٩٤٩ بەشی مۆسیقای کۆلێژی هونەرە جوانەکانی تەواو کردووە. لە ساڵی ١٩٥٩دا بڕوانامەی ماستەری لە ئەدەبی بەراوردکاری، لە ئەمریکا بەدەست هێناوە. دواتر وەک مامۆستای زانکۆ لە بەغداد، ئینجا بەسرە و دواتریش لە کوەیت دەستبەکار دەبێت. لە ساڵی ١٩٩٠ەوە ژیانی لە میسر بەسەر دەبات و هەر لەوێش کۆچی دوایی دەکا. «و. ک»

٣. بلدن حەیدەری (١٩٢٦-١٩٩٩): شاعیرێکی عێراقیی بە ڕەگەز کوردە. باوکی لە سوپای عێراقیدا بووە و دایکیشی فاتمە ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری بووە کە ئەوکات لە ئەستەنبووڵ کاری کردووە. کێبڕکێیەکی توند لەنێوان بلند و سەفای برایدا هەبووە. کە براکەی بڕیاری داوە ببێتە یاریزانی بۆکسێن، ئەمیش بووەتە یاریزان، دواتر کە ئەو دەبێتە شاعیر، ئەمیش خۆی لە مەیدانی شیعری عەرەبیدا دەبینێتەوە. «و. ک»

ئەحمەد مەتەر[1] و *ئیبراهیم عوبدیا*[2]. هەموو ئەمانە بە ئاشکرا هاواریان دەکرد کە ئەو عێراقییەکی تا سەرئێسقان کلاسیکییە.

جارێکیان و لە کاتێکدا کە ســیتا وەک هەمیشــە گۆرانیی دەگوت، ئاماژەم بە کتێبخانەکە دا و پرسیم:

– سەیر نییە نیشتیمانێ ئەو هەمووەی پێکەوە کۆ کردووەتەوە؟

ئەویش خەمساردانە وەڵامی دایەوە:

– چ شتێکی سەیرە؟

– سونە، شیعە، ئەرمەن، کوردەکان، عەرەب، مەنداری، جوولەکە و مەسیحی!

– لە ناخی هەموو مرۆڤێکدا، نیشــتیمانێک هەیە کە هی خۆیەتی! مرۆڤ بە خاکێکەوە گرێ نەدراوە، مرۆڤ تەنیا وابەســتەی ناخی خۆیەتی.

– تەنیا ناخی خۆی؟

– من و تۆ تەنیا وابەستەی ناخمانین.

– دەزانی نوێژکردنت سەیرە؟

– یانی سەیرە نوێژ بکەم؟

---

١. ئەحمەد مەتەر: لە گرنگترین شــاعیرەکانی عێراقە و ســاڵی ١٩٥٤ لە گوندێکی پارێزگای بەسرە لە دایک بووە. ئەحمەد لەژێر کاریگەریی بیستان و کەشوهەوا و دارخورما و شــوێنەکانی ئەو گوند و ناوچەیەدا بووە کە تێیدا گەورە بووە. لە چواردە ساڵییەوە دەستی کردووە بە شیعرنووسین و شیعرەکانیشی هەر لە بواری غەزەل و شیعری ڕۆمانسیدا بوون، بەڵام بەهرەی ئەحمەد لە پۆلی سێی ناوەندیدا دەر دەکەوێت کە قەسیدەیەکی حەڤدە بەیتی دەنووسی. «و. ک»

٢. ئیبراهیم عوبدیا: شاعیر و ڕەخنەگرێکی عێراقییە، ساڵی ١٩٢٤ لە بەغداد لە دایک بووە. «و. ک»

– نوێژکردنەکەت سەیرە، سرووتی نوێژەکە، شێوازەکەی، چۆنێتییەکەی، هەمووی سەیرە! کەسم نەدیوە وا نوێژ بکا.

بە لاقرتێیەوە گوتی:

– دڵنیام کە نەتدیوە.

لێم پرسی:

– بە نوێژکردن بێ موسڵمانی، بەڵام نە وەک سونە نوێژ دەکەی، نە شیعە. تۆ سەر بە کام مەزهەبەی؟

– ئەی پێم نەگوتی تەنیا وابەستەی ناخمانین؟

– دەڵێن ئایین ڕێگەی مرۆڤە بەرەو ناخی!

– وا مەزانی بێدینی!

– گوتم دەڵێن، نەموت خۆم بڕوام پێیەتی.

جگەرەیەکی پێ کرد و مژێکی قووڵی لێ دا، جا پرسیی:

– پێت وایە خۆشەویستی گوناح بێ؟

– واسینی ئەعرەج دەڵێت: *خۆشەویستی تاکە گوناحە کە خودا چاوپۆشیی لێ دەکا*، پاڵپشتیی ئەم قسەیەی دەکەم.

– قسە لە ئەدیبان وەردەگری؟

– وەک خۆم تەنیا شوێن قسەی ئەوان دەکەوم!

– بڵێ بزانم، بۆچی ڕقت لە دین و یاسا هەستاوە؟

– چونکە پاشماوەکانیان هێشتا لە ناخمدا ماوەتەوە، بەڵام کە تۆم دی، هەموو شت گۆڕا. توورەییم دامرکایەوە، دەتگوت لە ئاوی ڕووباری بەیەخت هەڵکێشراوم و دواتر وەک ئەوەی هەرگیز ڕۆژێ ئازار نەدرابم، لێی هاتبێتمە دەر.

– یانی وام لێ کردووی؟

– ئەســڵەن منت دووبارە ئافراندەوە، نغرۆی ئاوێکت کردم کە ئەوەی پێی بڵێی دین تێیدا نییە، لە پاشــماوەی ئەو ئایینانەی کە هێشــتاکە لە ناخمدا مابوونەوە، پاکت کردمەوە. منت کردە پیاوێک کە دین و ئیمانی تۆ بێ!

– ئەی ڕێک نەکەوتین کە تەنیا وابەستەی ناخمان بین؟

– وابەستەیی! وابەستەیی چیمان دەداتێ؟

– پێم وایە «جاروبار» مەودایەکی کەممان لە ســەلامەتی بۆ فەراهەم دەکا.

– وابەســتەیی نیشــتیمان، ئایین، خێڵ، خێزان و یاســاکان تەنیا کۆتوبەندمان دەکا. ژیانمان سەخت و ئاڵۆزتر دەکا.

– ئەی نەتگوت من بوومەتە دینت؟ ئەلەوەیا تۆ وابەســتەی منی و لەگەڵ ئەوەشدا نەفرەت لە وابەستەییت دەکەی؟

– بگرە نەفرەت لە هەر وابەستەییەک دەکەم کە بۆ تۆ نەبێ.

بزەیەکی کرد و گوتی:

– دەزانی چەندە زمانشیرینی؟

– ئەی تۆ دەزانی چەنێ زمانم شیرین دەکەی؟

خەندەیەکی کرد و منیش لە وردەکارییەکانی ئەو خەندەیەدا بزر بووم.

***

نزیکەی نۆ مانگ لەمەوبەر هاتمە لەندەن، چونکە لە دەست هەموو شت ڕام کردبوو. لەوە هەڵهاتبووم کە دەیان کەس لەبری خۆم، بڕیارم بۆ بدەن. لە ترۆپکی ناکۆکیی سیاسی و سەربازیدا ڕیازم جێ

هێشت. سەروەختی شەڕی کەنداو و دوو مانگ پێش ئازادکردنی کوەیت، لەو کاتەدا هەستم کرد نیشتیمانپەروەری و خێڵچییەتی و ئایین، جگە لە کۆمەڵێک درۆ هیچی تر نین. نیشتیمانپەروەرێکی دەمارگیر بووم و چارەکێکی تەمەنم هەر وا بەڕێ کرد. لاوێکی بیستوشەش ساڵان بووم، دوای بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماستەر لە ڕۆژنامەوانی و ڕاگەیاندندا، خەریکی نانی یەکەمین هەنگاوە شەرمنانەکانم بووم بەرەو دنیای نووسین. ئەو دەمانە، لێوانلێو بووم لە خۆشەویستی، هەموو شت و هەموو کەسێکم خۆش دەویست. وەفادار بووم بۆ نیشتیمانم، شانازیم بە ئایینەکەمەوە دەکرد، کەللەڕەقانە بەرگریم لە بنچ و بناوانی خێزان و هۆزەکەم دەکرد، کوڕی خێزانێکی گەورە بووم. بە کورتی باشترین نموونەی گەنجێکی سعوودیی خوێندەوار و دیندار بووم کە باوەشی بە دابونەریتدا کردووە. تا ئەو کاتەی لەیلام ناسی.

لەیلا هاوڕێی ڕۆژنامە و هاوکات لە یەکەمین ڕۆژنامەنووسەکانی سعوودییەش بوو. لەو سەردەمەدا تاوان بوو ئافرەت ببێتە ڕۆژنامەنووس و ئیدی بە هەموو شێوەیەک کۆمەڵگەیەکی وەها لەپای ئەو تاوانەدا، سزای ئافرەتەکەی دەدا. لەیلا زۆر مناڵ نەبوو و هەر سێ ساڵێک لێی گەورەتر بووم. بەڵام بە ڕای من، ڕووبەڕووبوونەوەی کۆمەڵگەیەکی نێرسالاری داخراوی وەک سعوودیە لە لایەن ئافرەتێکی بیستوسێ ساڵەوە، هەوڵێکی خۆکوژیی «سەرکەوتووانە» بوو، وەلێ ئەمە نەبووە کۆسپ لە بەردەم لەیلادا تاکوو بوێرانە لەپێناو ئازادیی خۆیدا نەجەنگێت، بوێرییەک کە ئەوکات لە ئافرەتێکی سعوودی نەدەوەشایەوە.

هاتنی لەیلا، ڕووداوێکی نائاسایی بوو لە ژیانمدا. ئەمڕۆکە دەزانم کە ناسینی ئەو، سەرلەبەری ژیانی گۆڕیم. گەر ئەوم نەناسیبا، ئەمەی ئێستە نەدەبووم. ئەو پێکدادانانەی کە لەنێوانماندا ڕوویان دا، کاتێک

هێشت. سەروەختی شەڕی کەنداو و دوو مانگ پێش ئازادکردنی کوەیت، لەو کاتەدا هەستم کرد نیشتیمانپەروەری و خێڵچییەتی و ئایین، جگە لە کومەڵێک درۆ هیچی تر نین. نیشتیمانپەروەرێکی دەمارگیر بووم و چارەکێکی تەمەنم هەر وا بەڕێ کرد. لاوێکی بیستوشەش سالان بووم، دوای بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماستەر لە ڕۆژنامەوانی و ڕاگەیاندندا، خەریکی نانی یەکەمین هەنگاوە شەرمنانەکانم بووم بەرەو دنیای نووسین. ئەو دەمانە، لێوانلێو بووم لە خۆشەویستی، هەموو شت و هەموو کەسێکم خۆش دەویست. وەفادار بووم بۆ نیشتیمانم، شانازیم بە ئایینەکەمەوە دەکرد، کەللەڕەقانە بەرگریم لە بنج و بناوانی خێزان و هۆزەکەم دەکرد، کوڕی خێزانێکی گەورە بووم. بە کورتی باشترین نموونەی گەنجێکی سعوودیی خوێندەوار و دیندار بووم کە باوەشی بە دابونەریتدا کردووە. تا ئەو کاتەی لەیلام ناسی.

لەیلا هاوڕێی ڕۆژنامە و هاوکات لە یەکەمین ڕۆژنامەنووسەکانی سعوودییەش بوو. لەو سەردەمەدا تاوان بوو ئافرەت ببێتە ڕۆژنامەنووس و ئیدی بە هەموو شێوەیەک کومەڵگەیەکی وەها لەپای ئەو تاوانەدا، سزای ئافرەتەکەی دەدا. لەیلا زۆر منال نەبوو و هەر سێ سالێک لێی گەورەتر بووم. بەلام بە ڕای من، ڕووبەڕووبوونەوەی کومەلگەیەکی نێرسالاری داخراوی وەک سعوودیە لە لایەن ئافرەتێکی بیستوسێ سالەوە، هەولێکی خۆکوژیی «سەرکەوتووانە» بوو، وەلی ئەمە نەبووە کۆسپ لە بەردەم لەیلادا تاکوو بوێرانە لەپێناو ئازادیی خۆیدا نەجەنگێت، بوێرییەک کە ئەوکات لە ئافرەتێکی سعوودی نەدەوەشایەوە.

هاتنی لەیلا، ڕووداوێکی نائاسایی بوو لە ژیانمدا. ئەمڕۆکە دەزانم کە ناسینی ئەو، سەرلەبەری ژیانی گۆڕیم. گەر ئەوم نەناسیبا، ئەمەی ئێستە نەدەبووم. ئەو پێکدادانانەی کە لەنێوانماندا ڕوویان دا، کاتێک

بۆ یەکەم جار لە بەرهەیوانی بینای ڕۆژنامەکەدا چاومان بە یەک کەوت، تەواو بیروباوەڕەکانمیان سەرەوژێر کردەوە، هەرچەند زۆر هەوڵم دا بەر بەم گۆڕانکارییە بگرم.

لەیلا لە هەر کچێکی تر نەدەچوو، پڕاوپڕ بوو لە ژیان. بە مانای وشە جیاواز بوو، هێندەش جوان نەبوو کە مرۆڤ شێت و شەیدا بکات، بەڵام خاکەڕاییەکەی هەر لە یەکەمین گفتوگۆماندا، دڵی منی «برد»، ئەو گفتوگۆیەی کە ئێستەش هەموو وردەکارییەکانیم بیرە. ئەو ڕۆژە لە بینای ڕۆژنامەکەدا دەچوومە دەر و لە ڕاڕەوی چوونەدەرەوەدا تووشی هاتم. بیرمە کاتێک بینیم کچێک لە بیناکەدایە، شاگەشکە بووم. حیجابی پۆشیبوو، وەلێ ڕووخسارە خنجیلانەکەی بە دەرەوە بوو، ئەمەشیان هەر بۆ ئەو سەردەمە دەگمەن بوو، هەڵبەت گەر «سەربازە ئەمریکییەکان»ی لێ دەربکەین.

کە بە لایدا تێپەڕیم، لەیلا وەستاندمی و گوتی:

– ببوورە، تۆی هوزام عاسم؟

منیش بە سەرسامییەوە وەڵامم دایەوە:

– بەڵێ! منم.

چاویلکە پزیشکییەکەیی ڕێک کردەوە و گوتی:

– ئەم ڕاپۆرتەی کۆتاییت ناوازە بوو.

بە تاسانەوە گوتم:

– بۆ ئەو ڕاپۆرتە هاتووی کە ئامادەم کردبوو؟

– نا نا، من لەیلام، هاوەڵە نوێکەتان.

– هاوەڵە نوێکەمان!

بە لاقرتییەوە گوتی:

– سەیرە ها؟!

کەمێک تەریق بوومەوە و گوتم:

– شتی وام نەگوتووە!

جا بە گاڵتەوە گوتی:

– بەڵێ، بێ گومان حەرامە!

هەستم کرد ئارەقە دەکەمەوە، جا بە دڕدۆنگیی کەسێکەوە کە یەکەم جارە قسە لەگەڵ کچێک دەکات گوتم:

– ئێستە کتومت چیت لە من دەوێ خوشکە لەیلا؟

– ڕەگەزپەرست و خۆبەزلزان مەبە لەگەڵم، ئێستا هاوەڵی یەکدیین و لە مافدا یەکسانین.

– چیی تریش؟

شانی ڕاتەکاند و زۆر بە سادەیی گوتی:

– باقییەکەی بۆ دوایی! بەم زووانە یەک دەبینین، ماڵئاوا.

هەر وا سەرسامانە بە پێوە وەستابووم و سەیرم دەکرد کە ڕۆیشت، بە جۆرێک هەنگاوی دەنا کە ئێستە دەزانم هاکەزایی نەبوو!

یەکەم چاوپێکەوتنم لەگەڵ لەیلا، بە مانا باوەکەی تاسێنەر نەبوو، چونکە وێڕای سەرڕاستی و بوێرییەکەی، زۆر لەگەڵم نەوت، وەلێ دڵم خەبەری دابوو کە ئەم ئافرەتە کاریگەرییەکی لەبیرنەکراو لە ژیانمدا جێ دەهێڵێ. هەر بۆیەش، دواتر کە لە کۆبوونەوەیەکی سەردەستەی تەحریردا چاوم پێی کەوت، نەمتوانی گوێی بۆ نەگرم و، هەوڵ نەدەم لێی تێبگەم و نەرمونیانانە لەگەڵی نەجووڵێمەوە. یەکەم ڕۆژنامەنووسی ئافرەت بوو کە لە ڕۆژنامەکاندا کاری دەکرد. هەرچەند ڕاپۆرتەکانی تایبەت بوون و ئافرەتێکی بێکەسایەتی نەبوو، بەڵام ئەوانی تر سووک

لێیان دەڕوانی و منیشت هەستم کرد پێویستی بە کەسێکە تاکوو پێش کاری ڕۆژنامەوانی، داکۆکی لە مافەکانی بکات، ئەمەش لەپێناو ئەوەدا کە وەک مرۆڤێکی ئاسایی بژی. لە یەکەم کۆبوونەوەماندا بەرگریم لێ کرد، چونکە هاوەڵێکمان بە شـــێوەیەکی ناڕاســـتەوخۆ گوتی کە ئەو ئافرەتـانەی مـاڵ جێ دەهێڵن تـا خۆیـان لە کـاروبـاری پیـاوانەوە هەڵبقورتێنن، لەم دوو شــتە تێپەڕ ناکەن: یان ئەوەتا سـۆزانین، یانیش پەنا بە خودا کوڕانی!

بیرمە قســەکانیم پێ بڕی و گوتم: هەموو کەس لە خۆیەوە لەوانی تریش دەڕوانێ! ئێمە چاو لە ئەخلاقی خۆمان دەکەین و بڕیار لەســەر ئەوانی تر دەدەین.

هەرچەند ئەم قســەیە خراپ بەســەر پەیوەندییەکانمدا شـکایەوە و هەر لەو ڕۆژەدا پشـتگیریی زۆرێک لە هاوەڵانمم لە دەست دا، چونکە منیان وەک کەسێکی شەهوەتباز دەبینی کە لەپێناو سۆزانییەکدا پشتی براکەی خۆی لە عەرد داوە، بەڵام هەر ئەو ڕۆژە، خۆم و لەیلاشـــم بەدەســـت هێنا. لەو ڕۆژەدا بۆم دەرکەوت کە ئافرەت لە وڵاتی مندا جەنگاوەرێکی مافخوورواوە. هەر بۆیە بەرپرسیارییەتیی پاڵپشتیکردنیم لە وەرگرتنی مـافی خۆیدا لە ئەســـتۆ نـا، یان گوتم لانیکەم دەتوانم بەشداری دژایەتیکردنی نەبم، کە ئەمەش نزمترین پلەی ئیمانە!

کۆبوونەوەکە کۆتـایی هـات و کە ڕۆیشـــتین، لەیلا پێی گوتم: سوپاس بۆ داکۆکییەکەت هوزام، خێر بێتە ڕێت!

لە شـەرمان هەستم دەکرد خوێن هورووژم دێنێتە ڕوخسارم، پێم گوت:

– من بە تایبەت داکۆکیم لە تۆ نەکرد، بەڵکە بە گشـــتی لە ئافرەتم کرد.

– بڕوا بکە، گەر بەس بۆ من بووایە، پێی دڵخۆش نەدەبووم. دڵخۆشـــم کە بەرگری لە لاوازەکـان دەکەی و ئەمەش لە خۆیدا نیشانەیەکی باشە.

نازانم بۆ ئەوکات خۆمم لەوە دزییەوە کە بڵێم بەرگریکردنەکە لەو بووە، نازانم بۆچی ئەویش نەیگوت دڵخۆش بووە بەوەی کە پشـتی ئەوم گرتووە، پێم وایە لەوە ترساوین کە سۆزێک لە قووڵایی ناخماندا بورووژێنێت. وەک خۆم، هەستم دەکرد گەر وام بوتایە، ئەوا نیازخراپ دەردەکەوتم کە واش نەبوو، لام وایە ئەویش دەترسا کە دڵخۆشییەکەی بە داکۆکییەکەی خۆمەوە ببەســتمەوە، چونکە زۆر کات پیاوانی لای خۆمـان بەم جۆرە لە هەســتی ئـافرەتـان تێـدەگەن. ئـاخر لە کۆمەڵگەکەماندا هەموو ئافرەتێک سۆزانییە، تا ئەو کاتەی پێچەوانەکەی دەسەلمێنرێت.

دوای یەکەم کۆبوونەوە، ماوەیەکی زۆر چاوم بە لەیلا نەکەوتەوە، بەڵام ئەو ڕاپۆرتـانەم دەخوێندنەوە کە ئـامـادەی دەکردن و زۆربەی هەرە زۆریان لەبەر بابەت و نووسینە بوێرانەکەیان، بڵاو نەدەکرانەوە. هیچ کاممان نەماندەتوانی لە ئاســت زیرەکیی لەیلادا خۆمان لە گێلی بدەین، لانی کەم لەنێوان خۆماندا! لەیلا هەر دەتگوت بۆ ئەوە لە دایک بووە ببێتە ڕۆژنـامەنووس، زیرەک، تێکۆشــەر، چـالاک و ورد، لە چاودێریکردن و بڵاوکرنەوەی هەواڵیشدا باش بوو.

بەرە بەرە لەیلا فکری داگیر دەکردم، خوێندنەوەکانم دەگۆڕان و وردە وردە بیرکردنەوە کۆنەکانم لەژێر فشــاری گۆڕانکاریدا تێک شـکان. وام لێ هـات لەگەڵ ئـافرەتـاندا نەرمونیان بم و گەشـتە دوورودرێژەکەم لە گەڕان بەشـوێن عیشـق، مرۆڤ و ئیمان و بووندا دەستی پێ کرد.

لە ســـایەی ســـەری لەیلاوە، تێگەیشــتنەکـانم بۆ ژیـان و بیروباوەڕەکانم بە تەواوی گۆڕان. سـەیرم لێ دەهات کە بیستوشەش



Scanned with CamScanner

ساڵ، پیاوێکی ڕووکەشبین بووم، هەرچەند بڕوانامەی بەرزی زانکۆم هەبوو، بەڵام دواجار پیاوێکی کولتووریی سادە بووم و بە چاو شتەکانم هەڵدەسەنگاندن.

لەو ماوەیەدا، سەرم بە جیهانی فەلسەفەدا کرد، سەرەتا بە ئەرستۆ، هیگڵ، ئەفلاتوون و سوقرات ئاشنا بووم. ئاخر ئەو سەردەمە دەستخستنی کتێبی فەیلەسووفانی تر لە ڕیازدا ئاسان نەبوو و پێی کافر دەبوویت. هاوزەمان کەسێکم لە دەوروبەرم شک نەدەبرد کە گرنگی بە فەلسەفە بدات، هەر بۆیە لە کۆبوونەوەی دووەممماندا، پرسیارم لە لەیلا کرد کە لە کوێ ئەو کتێبانە دەست بخەم. لەیلا زۆر کەیفی بەم پرسیارە هات و هەستم کرد زۆر بە هەندی وەرگرتووە، چونکە دوای دوو ڕۆژ بڕێکی زۆر کتێبی دامێ. ئەلێرەوە گەشتی ئازادبوون و قۆناغی گەشەسەندنی من دەستی پێ کرد. پەیوەندیشم لەگەڵ لەیلا، شێوەیەکی تری وەرگرت.

***

پەیوەندییەکەمان لە نیسانی ١٩٩٠دا دەستی پێ کرد، پێش ئەو جەنگەی کە لەپڕ هەڵگیرسا و نیشتیمانپەروەرێتیی لە دڵی مندا نەهێشت و لای زۆرێکیش زیندووی کردەوە. لەوەتەی لەیلام ناسیبوو، بیروباوەڕەکانم هێدی هێدی دادەڕزان، دواتر جەنگیش هەڵگیرسا و بە جارێک داروبەردی لە ناخمدا هەڵتەکاند و، گشت باوەڕە کۆنەکان سەرەوژێر بوونەوە. بابەتەکە ئەوە نەبوو کە لەیلا لە من جیاواز بێت و تەواو، بەڵکە مرۆڤبوونی لێ دەرچێت، لە هەموو شتێک خۆی داماڵیبوو، هیچ شتێک کۆتوبەندی نەکردبوو، ئازاد بوو، تا خوا حەز بکات ئازاد. سەرم لەم ئازادییە سووڕ مابوو، باوەڕم پێی هێنا و لە دوای ئەو، نەمتوانی باوەڕ بە هیچ شتێکی تر بێنم.

ئێستە دەزانم کە ئەوە ئافرەتە پیاو ئازاد دەکات، تەنیا ئافرەت دەتوانێ لە کۆیلایەتی نەجاتمان بدات و هاوزەمان تاکەکەسیشە کە

دژوارترینی دژوارەکانە و کەس سەری لێ دەر ناکات! ژیانە کە کەس بتوانێت بمانکاتە کۆیلە. ئەمە ئەو هاوکێشـــە ئاڵۆزەی ژیانە، نهێنییەکەیەتی، نـاتوانێ شـــیکاری بکـات. ئـافرەت مەتەڵی ژیـانە، نهێنییەکەیەتی، دژوارترینی دژوارەکانە و کەس سەری لێ دەر ناکات!

چەندان کاتژمێر بە تەلەفۆن لەگەڵیدا قسـەم دەکرد، چونکە هێڵێکی تـایبەت بە ژوورەکەی خۆیی هەبوو و ئەمەش بۆ ئەو سـەردەمە ئـاســایی نەبوو. ئـاخر تەنـانەت منیش هێڵی تەلەفۆنیی تـایبەت بە مـاڵەبـاوانمم بەکـار دەهێـنا کە نزیکەی حەوت ئەنـدامی خێزانەکەم هاوبەشییان پێوە دەکرد.

پەیوەندییەکەمان پەیوەندییەکی ئاســایی نەبوو، لە پەیوەندیی هیچ کوڕ و کچێکی کۆمەڵگەکەمان نەدەچوو، چونکە ئەوە خۆشەویستی و شـــەهوەت نەبوو کە ســـەرەتا کۆی کردینەوە، بەڵکە ژیان بە یەکی گەیاندین، پرســیارەکانمان، گومانەکانمان، خەونەکانمان، هەوڵدان بۆ گەیشـــتن بە یەقینێک لەم ژیانەدا. بەڵام من لە عیشـــقیدا توابوومەوە، هەســـتم دەکرد هێدی هێدی، ڕۆژ دوای ڕۆژ و گفتوگۆ دوای گفتوگۆ لە دەریـای ئەودا نغرۆ دەبم، نغرۆکردنی پیاوێکی وەک من بۆ لەیلا، ئاوخواردنەوە بوو.

پاش چەندان ســاڵ لە دابڕان و وێڕای ناســینی چەندان کەس لە مـاوەی ئەو دوو دەیەیەدا، کەچی جگە لە لەیلا، نـاوەکـانیـانی لێ دەرچێت، وردەکاریی یەک کەسیانم نایێتەوە یاد. تەنیا لەیلایە کە ورد و درشـتیم لە یادە. تا ئێســتەش نازانم کە بۆچی وردەکارییەکانی لە زەینمدا چەســـپیون، تۆ بڵێیت هی ئەوە بێت کە کچێکی کەموێنە بوو، یان لەبەر ئەوەیە کە یەکەم ئافرەتی ژیانم بوو. بە زۆری وایە، پیاو قەت یەکەم ئافرەتی ژیانیی بیر ناچێتەوە، با بە چەندانی تریش ئاشـنا ببێت!

من و لەیلا، تا ئەیلوولی هەمان ساڵ لە پەیوەندیدا بووین. شـەش مانگێک بەسەر پەیوەندییەکەماندا تێپەڕیبوو و، ئەم ماوەیەش بۆ ئەوە

بەس بوو کە بڕیاری هاوسەرگریی لەگەڵ بدەم. سەرەتا وتم ڕەنگە بیرۆکەی هاوسەرگرییەکەی بەدڵ نەبێ، بەڵام پشتگیریی کرد و زۆریش پێی دڵخۆش بوو. لەو کاتەدا هەستم کرد تەواوی دونیا موڵکی منە، لە ژیاندا سەرکەوتووم، چووزانم کە ئەم بیرۆکەی هاوسەرگرییە دەبێتە گەورەترین تەنگژەی ژیانم، تەنگژەیەک کە تا هەنووکە بە دەستییەوە دەناڵێنم.

هەندێک ڕووداو و پێشهات کە تووشمان دێن، بە تەواوی ژیانمان دەگۆڕن، بە جۆرێ کە دواتر هەست دەکەین تازە لە دایک دەبینەوە، دەبینە کۆمەڵێک بەنیئادەم کە هیچمان لەوانەی پێشووتر ناچین! لەیلاش کارەساتبارترین پێشهاتی تەمەنم بوو و برینگەلێکی بەسەر جەستەمەوە هەڵکۆڵی کە تا ئەم ساتەش سارێژ نەبوون.

نازانم چۆن ناوی خێزانەکەی لەیلام پشتگوێ خست. تا سەرئێسقان خێڵەکی بووم و لە هەر نێرێکی تر زیاتر پابەندی خێڵ بووم! نە بیرم لە ناوی خێزانەکەی کردەوە، نە ئەوەشی کە ناوی خێزانەکانمان پێکەوە دەگونجێن یان نا، تێناگەم کە بۆ وا بووم! وا بزانم کاتێک عاشق دەبین، چیتر ناوەکان ناناسینەوە، بیرمان ناکەونەوە و جگە لە ناوی یەکەممان، باکمان بە هیچ شتێکی تر نییە. ئەمڕۆکە دەزانم کە بە نیشتیمان و خێزان و دوو دەیەی تەمەن، باجی ئەم بیرچوونەم دا.

لەیلا بۆ من شیاو نەبوو (هەڵبەت وەک هۆز)، ئەم بابەتی هۆزەش گەورەترین بەدبەختیی سۆزدارییە کە مرۆڤ هەر ئەوەندە پێی کەوتە ناوی، ئیتر مەحاڵە لێی دەربچێت. تەنانەت گەر ئاسمانیش پەرجوو ببارێنێت، ئەم کێشەیە هەر بە چارەنەکراوی دەمێنێتەوە، بەڵام عیشق وامان لێ دەکا دەست بە سەرابی ئەگەر و وەهمی پەرجووەوە بگرین. عیشق وامان لێ دەکات تا مەرگ بیر لە هیوا و ئازار بکەینەوە،

ئاسمانیش منی لەم ئازارە بێبەش نەکرد، چونکە بێهیوا نەبووبووم لە هاتنی پەرجوویەک.

بەرووداوەستانەوەی خێزانەکەم ئاسایی نەبوو و بۆ هیچ کاممان بە خۆشی و شادی کۆتایی نەهات. لە ژیانی هەر یەکێکماندا ڕووداوێک هەیە کە تێیدا کیچێک دەکرێت بە گایەک، بەڵام ناکۆکیی من لەگەڵ خێزانەکەمدا بەم جۆرە نەبوو، چونکە پێشتر لەگەڵ هیچ یەکێکیاندا کێشەم نەبووبوو. لەیلا تاکە داواکاریی من بوو، یەکەمین و دواهەمین داواکاری کە نەهاتە دی و منیش لە هەر کەسێک زیاتر یاخی بووم. لە ڕووی هۆز و نزیکترین کەسەکانمدا وەستامەوە، تا کار لە ناکۆکیدا نەما و چووە قۆناغی ترازانەوە! گەیشتینە قۆناغێک کە یان دەبوو لەیلا هەڵبژێرم، یان ئەوان. هەرچەندە قورسە لە بەینی دوو کەسدا کە خۆشت دەوێن، یەکیان هەڵببژێریت، وەلێ من بە تەواوی بڕواوە، ڕاستگۆیانە لەیلام هەڵبژارد و دەستم لە هەموو ئەو شتانە بەردا کە بە خێزانەکەمیانەوە دەبەستمەوە، ئەو خێزانەی کە خەفەتی من کوشتبوونی! بەس دواجار بەم کارەم نەمتوانی دڵی خێزانەکەی ئەو بەدەست بهێنم، باوکی ڕازی نەبوو کە بە دەستی خۆی کچەکەی بخاتە دۆزەخێکەوە کە من خۆیشم چاک دەمزانی هەرگیز لێی دەرباز نابێت، چونکە کەس ناتوانێت بە ڕووی هۆزێکی دەمارگیردا بوەستێتەوە، جا با پشتیشی هەبێت و خۆی لە کێشە لا بدات و بە هەموو توانای خۆشییەوە بەرگری بکات.

دوا شەوم بیرە کە لەگەڵ لەیلادا قسەمان لەسەر ئەم بابەتە کرد، پێی گوتم: «گوێ بگرە هوزام! من دەتوانم خێزانەکەم ڕازی بکەم، بەڵام دەبێ دڵنیاییم بدەیتێ کە تۆ سووری لەسەر ئەم بڕیارە. گەر دەزانی لە کۆتا ساتەکاندا چۆک دادەدەی، منیش شەرمەزار مەکە، چونکە ئەوکات هەرگیز لێت خۆش نابم.»

ڕاستییەکەی زۆر لەم کارە دەترسام! وێڕای ئەو عیشقە بەتینەی کە بۆ لەیلام هەبوو، وێڕای گرژیم لەگەڵ خێزانەکەم کە بە ڕادەیەک قووڵ بووەوە، لە ماڵ دەرکرام و پەیوەندیم بە باوکمەوە نەما، کەچی لە قووڵایی ناخمدا هەستم دەکرد ورەم دەتەپێ! شتێک پێی دەگوتم کە ناتوانم لێیان دابڕێم. زۆر لەوە لاوازتر بووبووم کە بە ڕووی ئەو هەڵمەتەدا بوەستمەوە کە کرابووە سەرم. گەنج بووم، کەمئەزموون و سەرسلامەت، ژیانیش هێشتا پشتی لە عەرد نەدابووم.

زۆر لە خەمی لەیلادا بووم و لەو جەنگە دەترسام، ئاخر ئەو خەونی خۆی هەبوو و داهاتوویەکی گەش چاوەڕێی بوو، نەدەکرا بەهۆی منەوە ئاستەنگ بکەوێتە ژیانییەوە، هەر لەبەر ئەمەش بوو هاتمە ژێر باری ئەوەی کە دەستبەرداری شادمانیم بم و بە ناچاری واز لەویش بهێنم. هیچ دڵنەواییەک لەم ناچارییەدا نەبوو، نە بۆ من و نە بۆ ئەویش.

باش دەزانم کە وازهێنانم لە لەیلا، منی لای خێزانەکەم خۆشەویست نەکردەوە، بەڵام ئەم بڕیارەیان قبووڵ کرد تا بە تەواوی لە دەستم نەدەن، یان بۆ ئەوەی بیرۆکەی هاوسەرگرییەکە لە کەللەم نەداتەوە. دەزانم باوەشیان بۆ کردمەوە، تا لە بیرۆکەی هاوسەرگریکردن لەگەڵ لەیلا بمسڵەمێننەوە، بە جۆرێک مامەڵەیان لەگەڵ دەکردم، وەک بڵێیت تەنیا بۆ ئەوان ئافرێنرابم! ئەم هەوڵانەشیان هەستگەلێکی زۆری گاڵتەجاڕانەیان بەرانبەر ئەوان لا دروست کردبووم. هەستم دەکرد شتێک لەنێوانماندا شکاوە و هێز نییە چاکی بکاتەوە.

لەیلا داوای لێ کردم هەمووی بە بادا بدەم و دووبارە ببینەوە بە هاوڕێی یەکدی، بەڵام من مانگێک پشووم وەرگرت و بە تەواوی لێی دوور کەوتمەوە. نەمدەتوانی نە بیدوێنم، نە بشیبینم، نەمتوانی ئەوە

لەبیر بکەم کە ڕووی دا، نازانم چۆن چاوەڕێ دەکەن پیاوێک کە ڕۆژگارێک عاشقی کچێک بووە، ئێستە وەک هاوڕێ لێی بڕوانێت!

خەم و خەفەت سەراپای تەنیبووم، لە ماڵ مامەوە و بە درێژایی پشووەکەم، نەمتوانی بچمە دەر. بیرم لە ژیانی بێ لەیلایی دەکردەوە، چۆن خۆم لە تەماشاکردنی لا بدەم، چۆن دوور لەوەوە ژیانم بگوزەرێنم. سەدان پرسیار دزەیان دەکردە سەرمەوە، ئەم پرسیارانە هیچ وەڵامێکیان نەبوو و هەر ئەوە بوو کە شەکەت و خەمگینتریان دەکردم. تا ئەو کاتەی لەیلا تەلەفۆنی کرد.

دواهەمین تەلەفۆنی لە پێنجی تشرینی دووەمی ۱۹۹۰دا بوو. کاتژمێر نزیک چواری بەیانی بوو کاتێک زەنگی تەلەفۆنەکە ڕای چڵەکاندم، بەڵام وەک عاشقێک، زانیم کە ئەوە! بە لەرزە لەرز و دڵەکوتێوە، بەرەو تەلەفۆنەکە ڕام کرد.

بە دەنگێکی پارێزکارانەوە گوتی:

– هوزام، لەیلام!

منیش بە دەنگێکەوە کە تاڵاوی خەفەت گری کردبوو، وەڵامم دایەوە:

– وات دەزانی دەنگتم بیر دەچێتەوە؟

– واز لەم قسانە بێنە هوزام. پیاوەتییەکم لەگەڵ دەکەی؟

– لە خزمەتتدام.

– دەبێ بزانی ئەمەی کە پێت دەڵێم، زۆر ترسناک و نهێنییە!

بە چپە و سەرسووڕمانەوە گوتم:

– گوێقوڵاغم!

– سەرەتا بەڵێنم بدەیێ کە ئەم قسانە تەنیا لەنێوان من و تۆدا دەمێننەوە هوزام.

بەرە بەرە دڵەڕاوکێ دای دەگرتم و پێم گوت:

– پێویست ناکا بەڵێن بدەم لەیلا، بەڵام دەی، بەڵێن بێ!

جا هێزی دایە بەر خۆی و گوتی:

– باشە! باش گوێم بۆ بگرە هوزام، سەرنجت لەسەر قسەکانم بێ، چونکە دەبێ بە تەواوی سەرنجت لام بێ.

– زۆر باشە.

– سبەی خۆپیشاندانێکی ژنانە ساز دەدەین، دەیان ژنی ماڵ و ئەکادیمی و خوێندکار بەشدار دەبن، جا ئێمەش لەم خۆپیشاندانەدا پێویستمان بە تۆیە.

بە سەرسامییەوە گوتم:

– مەبەستت چییە لە خۆپیشاندان؟

– خۆپیشاندانێکی ئاشتەوایانە، داوای مافی لێخوڕین دەکەین.

– لێخوڕینی چی؟!

– سەیارە.

– تێنەگەیشتم!

– سەیارەی خۆمان لێدەخوڕین هوزام، تۆیش دەبێ خۆپیشاندانەکە تەسویر بکەی.

– گاڵتە دەکەی!

– لە گاڵتە دەچێ؟

– خۆشـــت دەزانی خەریکی چیی؟ دەزانی بەم کارەت دەکری تووشی چ بەڵایەک بی؟

– هیچ ئازادییەک بێ شۆڕش بەدەست نایەت هوزام!

– ئەمە شۆڕش نییە، خۆکوژییە.

بە گاڵتەوە گوتی:

– با بڵێین شەهیدبوونە!

– نەخێر لەیلا، تکایە ئەم کارە مەکە. ئاخر تۆ نازانی کە دەکری ئەم شێتییە چیت بەسەر بێنێ.

– ناتوانم وەک تۆ ترسـنۆکانە سـەر کز کەم هوزام! من ئافرەتێکم دەتوانم داکۆکی لە ماف و ئازادیی خۆم بکەم. ئامادەشـــم باجەکەی بدەم.

هیچم بۆ نەمایەوە و گوتم:

– ئێستە چیت لە من دەوێ لەیلا؟

– پێویســـتم بە یارمەتیتە هوزام. پێویســـتمان بە کەسێکە ئەم خۆپیشاندانە تەسویر بکا. منیش جگە لە تۆ متمانەم بە کەسی تر نییە. دەترسم گەر یەکێکمان داوا لە پیاوێکی تر بکەین، هەواڵەکە پێشوەختە بڵاو ببێتەوە و نەهێڵن خۆپیشاندانەکە بکەین.

– بۆ لات وایە ڕێتان لێ ناگرن؟

– ڕێ لە تەواوکردنی دەگرن، بەڵام گەر یارمەتیمان بدەی، ناتوانن ببنە کۆسپی بەردەم دەستپێکردنی.

ئارەقەم دەکردەوە و پێم گوت:

– تاکە پیاوم کە بەشدار دەبێ؟

– یەکەم تۆ بەشـدار نابی، تۆ تەنیا تەسـویری دەکەی، دووەمیش هاوسەری زۆرێک لە خۆپیشاندەران بە سەیارە بە شوێنمانەوە دەبن، هەر بۆیە، لە هیچ مەترسێ.

بە هەڵچوونەوە پێم گوت:

– ئەمە یاساشـکێنییە لەیلا! تۆ نازانی ئەم خۆپیشـاندانە چیی لێ دەکەوێتەوە.

هەتەرانە گوتی:

– هوزام، داوای چاکەیەکم لێ کردی، یان ئەوەتا دەیکەی، یان وەک ئەوەی نە بات دیبێ و نە بۆران، لە بیری دەکەی و بەو جۆرەی کە بەڵێنت دا، بە کەسی ناڵێی.

کەمێک بێدەنگ بووم و لەو کاتەشدا بیرم لە لەیلا دەکردەوە. بیرم لەم ئـافرەتە چەلەنگە دەکردەوە کە لەبەر ترسـنۆکی و لاوازیم دەسـتبەرداری بووم. بیرم لە یاخیبوونەکەی، چاونەترسـییەکەی دەکردەوە، لە هەوڵەکانی کە باکی بەوە نییە بە چی باجەکەیان دەدا و هەر سوورە لەسەر بەدیهێنانی ئامانجەکەی. لەیلا ڕێک پێچەوانەی من بوو و دەمزانی کە قەت ڕۆژێک پێی ناگەمەوە.

مێشکم ساف کرد و پێم گوت:

– با وابێ، لەبەر تۆ دەیکەم.

– هوزام، چاک بزانە کە ئەمە خۆپیشـاندانێکی ئاشتەوایانەیە، بەڵام دەکرێ شـتی تری لێ بکەوێتەوە. کەسـمان نازانین کە سـبەی چی دەقەومێ.

– گرنگ ئەوەیە تۆ ئاگاداری لەیلا.

– زۆر باش ئاگادارم، لەبەر ئەمەشە بە تۆی دەڵێم.

– باشه لەیلا، بەیەکەوە دەیکەین، لەپێناو تودا، تەسویرەکە دەکەم.

– بەڵکە لەپێناو کومەڵگەکەتدا هوزام، لەپێناو یەکسـانیدا. لەپێناو خوشک و دایک و ئەو کچانەی کە ڕۆژێک دەتبن.

– بەڵکە لەپێناو تودا لەیلا، هەمیشـە بیرت بێ کە من ئەمەم لەبەر تو کردووە.

ئەو شەوە خەو نەچووە چاوم، دەمزانی کە شەشی تشرینی دووەم بە تەواوی ژیانم دەگۆڕێ، یان ئاڵوزتری دەکات، یان یەکجاری کوتایی پێ دێنێت! وەلێ هەوڵم دا ئەم بیرۆکانە لە مێشـکم دەر بکەم، چونکە خواستی جۆشسەندووم بۆ ئەنجامدانی شتێک لەپێناو لەیلادا، زۆر لە ترس و دڵەڕاوکێ و هەر هەستێکی دی بەهێزتر بوو.

کامێرەی ڤیدیۆکردنەکەم دەرهێنا و کردم بە شەحنەوە. بە درێژایی شـەو بیرم لەوە دەکردەوە کە سبەی چی دەقەومێت. هەرچی هەستـەری تێ کردبووم و یەکەمین ختوورەم لەیلا بوو. لە خۆم زیاتر خەمی ئەوم بوو، بیرم لەوە دەکردەوە چ کارەساتێکی بەسـەر دێت و ئەم شـێتییەی پەلکێشـی چیی دەکات. نەمدەزانی چیی لە سـەردایە، هێندەم دەزانی کە بە سەیارەکەم شوێن لەیلا دەکەوم و لە مەلەز یەک دەگرن. دڵنیا بووم کە ئەمە خۆکوژییەکی کومەڵایەتییە، کەچی وێڕای ئەمە و هەرچەند دەمزانی کە تەسـویرکردنی خۆپیشـاندانەکە شـایەنی لێخۆشـبوون نییە و لە ئافرەتەکان خراپتر بەسـەرمدا دەشـکێتەوە، چونکە تاکە پیاو دەبم لەناویان، بەڵام هیچی ڕێگر نەبوو لەوەی کە لەو کاتەدا کە لەسـەری ڕێک کەوتبووین، بەرەو ماڵی لەیلا بەڕێ بکەوم.

بەرەو ماڵیان چووم و داروونەدارم خۆشـەویسـتییەک و کامێرە سـادەکەم بوو. ویسـتێکی زۆری قەرەبووکردنەوە دنەی دەدام، قەرەبووکردنەوەی لەیلا!

ئەمڕۆکە دەزانم هەموو ئەو شـــتانەی کە کردم، لە هەســتی پەشــیمانییەوە ســـەرچاوەیان دەگرت و پێم وا بووە کە بەم کارە گەمژانەیەم، دەتوانم دڵی لەیلا بەدەســـت بهێنمەوە و خۆم لە تاوانی ترســنۆکییەکەم بەری بکەم، واتە بەم یـارمەتیـدانەم خۆم لە بێئومێدکردنی لەیلا پاک دەکەمەوە.

سەیارەکەم لە بەردەم ماڵی لەیلادا ڕاگرت و لە شڵەژاندا دەلەرزیم. هەموو شــتێک برووســـکەئاســا تێپەڕی، هەر لە ســـاتەوەختی تەلەفۆنەکەیەوە تا گەیشتنەماڵیان، دەتگوت لە خەونێکی تیژتێپەڕدام و تەنیا کاتێک مرۆڤ دەکرێت لێی تێبگا کە کۆتایی دێت.

کاتێک لەیلام لەگەڵ کچێکی تر لە بەردەم ماڵیاندا بینی، هەڵچووم. منی بینی، جا ئاماژەی بە هاوڕێکەی دا ســـوار ســـەیارەکە ببێت و خۆیشـی سڵاوی لێ کردم و، هەر کە نزیک بووەوە، دابەزیم. سـەری قسەی کردەوە و گوتی:

– ئاخری هاتی هوزام!

– بۆ وات دەزانی نایەم؟

– ڕاســـتییەکەی بەڵێ، ئەزموونی ڕابردووم لەگەڵتدا، پێی دەگوتم کە نایەی!

– هیوادارم ئەمەیان تۆزێک قەرەبووی بکاتەوە.

کەمێک بێدەنگ بوو، جا دەســـتی درێژ کرد، قۆڵی گرتم و گوتی: «سوپاس هوزام! پێی دەزانم.»

کە لەیلا لە پشت سووکانەوە دانیشت، هەستم دەکرد دڵم خەریکە لە لێدان دەکەوێت، هەزاران ڕوخســـاری ڕیشـــن بە کوتەکەکانی دەستیانەوە و سـەدان کەلەپچەی پیاوانی ئاسـاییش، پەڕینە زەینمەوە.

لە مێشکمدا یاسا بووبووە دێوەزمە و هەستم دەکرد تا دێ چاونەترسیم لە کزی دەدا.

دیمەنەکە تۆقێنەر بوو! بینینی سەیارەی ئافرەتان کە یەک لە دوای یەک شوێن کاروانی سەیارەکانی تر دەکەوتن. ڕوخساری تاساوی سەرنشینانی سەیارەکانی دیکەش کە تێدەپەڕین، زیاتر منی ترساند. لە بەردەممدا سەیارەیەکی پڕ لە گەنجم بینی کە هەوڵیان دەدا سەر بخەنە سەری ئافرەتەکان و ناچاریان بکەن سەیارەکە بوەستێنن و دابەزن. ئەلەو کاتەدا بوو کە زانیم بارودۆخەکە زیاتر دەشڵەقێ و بە باشی کۆتایی نایەت.

بە دەستی لەرزۆکەوە هەوڵم دەدا کامێرەکە وەرسووڕێنم، بەڵام هەر کە سەیارەی پۆلیسەکانم بینی، لەژێر کوشنەکەدا شاردمەوە. دوو ئۆتۆمبێلی پۆلیس دەوری کاروانی ئافرەتەکانیان دا و بەرەو بنکەی پۆلیسی ئەو گەڕەکەیان بردن.

تا بنکەی پۆلیس شوێنیان کەوتم، ئافرەتەکانم بینین کە دابەزین و چوونە بیناکەیەوە. نەمدەزانی دەبێت چی بکەم! نەمتوانی خۆپیشاندانەکە تەسویر بکەم و دەمزانی گەر بەشوێن لەیلاشدا بچمە بنکە، ئەوا دەیان کەیسم بۆ دروست دەکرێت و کەس نازانێت سزاکەیان چی دەبێت، هەر لە بەشداریکردنی ڕێکخستنی خۆپیشاندانەوە، تا پشێوی و هاودەمیکردنی کچێکی بێگانە. هەروەها وەستاندنی ئۆتۆمبێل لە نزیک بنکەی پۆلیس بۆ ماوەیەکی درێژ، گومانی دروست دەکرد. بێ ئەوەی پلانێکی دیاریکراوم هەبێت، گەڕامەوە ماڵی لەیلا. هەر وا نیو سەعات لە بەردەم ماڵیاندا وەستام و بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێت چی بکەم.

زاتم دایە بەر خۆم و زەنگم لێدا. باوکی دەرگەی کردەوە و بە بینینم شاگەشکە بوو. بەڵام هەر زوو و پێش ئەوەی بیر لە هۆکاری هاتنم بکاتەوە، پێم گوت کە سەرچاوەیەکی ڕۆژنامەوانی پەیوەندیی

پێوە کردووم و ئاگاداری کردوومەتەوە کە لەیلا لە بنکەیەکی پۆلیس گیراوە، چونکە لەگەڵ دەیان کچی تر، بەشــــداریی خۆپیشــــاندانێکی ئافرەتانەی کردووە. تا ئەم ساتەش سیمای باوکیم لە بەرچاوە و پێم وا بوو زانیویەتی کچەکەی بەتەمای چییە، چونکە لە ماڵێکی ئازاد و تا خوا حەز بکات کراوەدا گەورە بووبوو. بۆ یەک ساتیش لەو بڕوایەدا نەبووم کە بێ پرسی خێزانەکەی بەشـداریی خۆپیشـاندانی کردبێت، چونکە دەمزانی کە بێ پرســـی ئەوان یەک هەنگاو نانێت. ئاخر ئەوان هەر لە ســــەرەتای ســــەرەتاوە، ئاگاداری وردەکارییەکانی پەیوەندییە کورتخایەنەکەمان بوون.

باوکی دەتگوت بەســـەر دنیاوە نییە، ئەمەش زیاتر منی پەشـۆکاند. هەر وا دەستەوەستان ســەیری یەکترمان دەکرد و پرسیی: «چۆن، کەی، لە کوێ، بۆ پێی نەگوتم، بۆچی وای کرد، مەسەلە چییە، بۆ کوێ بچین؟» پێشنیارم کرد پەیوەندی بە یەکێک لە برا گەنجەکانییەوە بکات و بە زووترین کات، لەگەڵیدا سەردانی بنکەی پۆلیس بکەن.

هەمدیس کلکی شـــەرمەزاریم بەشـــوێن خۆمدا کێش کردەوە و گەڕامەوە ماڵ!

ئەو شـەوە، درێژترین شـەوی تەمەنم بوو. چەند جارێک هەوڵم دا پەیوەندی بە ماڵی لەیلاوە بکەم و هیوام دەخواست کە وەڵام بدەنەوە. زەنگی تەلەفۆنی ماڵیان بۆ ســـاتێک بێدەنگ نەدەبوو، بەردەوام لێی دەدا. خامۆش نەدەبوو و کەسیش نەبوو هەڵی بگرێت.

هەواڵی خۆپیشاندانەکە وەک ئاگری ناو پووش تەشەنای سەند، لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا هەموو *ڕیاز* بە هەواڵەکەی زانی. بەرە بەرە ناوەکان بڵاو دەبوونەوە، لە شـــارێکی بێســـەرەوبەرەدا کە لە هەر شـــارێکی دی زیاتر ڕاستییەکان دەشـێوێنێ. وەلێ من ســووچێکی ژوورەکەم گرتبوو و چـاودێریی تەلەفۆنەکەمم دەکرد کە لە هۆڵی

خانووەکەمانەوە درێژ بووبووەوە، لە خوا دەپارامەوە پەیوەندیم پێوە بکات و ئەم کارەساتە بە کەمترین زیان کۆتایی بێت.

هەر کە زەنگی تەلەفۆنەکە لێی دا، دڵم ڕاچەنی. برادەرێکی ڕۆژنامەم بوو و داوای لێ کردم خێرا سەیری کەناڵی سی ئێن ئێن بکەم. یەکسەری دام خست و خستمە سەر کەناڵەکە و بینیم چەند دیمەنێکی خۆپیشاندانەکە نیشان دەدا، ئەوکات نەمدەزانی کە ئەم کەناڵە چۆن ئەمەی بەدەست گەیشتووە. بەڵام دواتر بۆم دەرکەوت وێنەگرێکی مەزن و شاعیرێکی داهێنەر، توانیبووی تەسویری بکات و هەر خۆیشی دواتر باجەکەی دابوو.

هەر بە ڕاستی کە دووبارە لە تەلەفزیۆندا چاوم پێی کەوتەوە، دڵنیا بوومەوە کە خۆپیشاندانەکە هەرای ناوەتەوە، بە تایبەت لەبەر ئەوەی کە لە کاتێکی زۆر هەستیاری سیاسیدا کرا و ئەوکات هەموو سەرنجەکان لەسەر سعوودییە بوون. ئەو شەوەم بە کۆکردنەوەی زۆرترین زانیاری لەبارەی چارەنووسی ئافرەتەکانەوە بەسەر برد. پشتم بە زۆر ڕۆژنامەنووس و هاوڕێی وەزارەتی ناوخۆ بەست، بەڵام بە دەرئەنجامێکی جیاواز نەگەیشتم.

بۆ شەوەکەی، بەڵێ دروست لەو شەوەدا، بە جددی کەوتمە بیری ژیان و چارەنووسم. بیرم لەو ژیانە کردەوە کە دەیگوزەرێنم و لەو کۆمەڵگەیەش کە دەوری داوم و بە ناچاری بەرگەییم گرتووە، شکستە ئابڕووبەرەکانم بیر هاتنەوە و بیرم لەوە کردەوە کە لە چەند ڕۆژی داهاتوودا چی لە دەست دەدەم. دەمزانی لە کۆمەڵگەیەکی وادا، هیچ شتێک چاوەڕێم ناکات. هیچ مرۆڤێک ناتوانێت بە ئازادی لە ژینگەیەکی وادا بژی کە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە کۆیلێنراوە، کۆمەڵگەی ئێمە مازۆخیترین کۆمەڵگەیە، چێژ لە ئازاردانی خۆی دەبینێت، کەیفی بەوە دێ تاکەکان کۆیلەی یەک بن. نەمدەتوانی لەو خاکەدا بەردەوامی بە

ژیان بدەم، خاکێک کە ئێستە دەزانم بۆ یەک ڕۆژیش خۆشی نەویستووم.

بۆ شەوەکەی، هەستم کرد خەریکە وابەستەییم بۆ هیچ شتێک نامێنێت، بۆ ئەو نیشتیمانەی کە قەت خۆشی نەویستم، بۆ خێزانێک کە ڕاگرتنی دڵی هۆزی پێش خۆشبەختی من خست، بۆ هۆزێک کە نەیهێشت هاوسەرگری لەگەڵ ئەو کچەدا بکەم کە بە دڵ و بە گیان عاشقی بووبووم!

ئەو شەوە هەر وا بێدار مامەوە و چاوەڕێ بووم لەیلا خەبەرێکم بداتێ. بەڵام تەنیا لە لایەن ڕۆژنامەنووسە هاوپیشەکانمەوە پەیوەندیم پێوە دەکرا تا هەواڵی بەشداریکردنی هاوپیشە نەیارەکەیانم پێ بگەیەنن کە دژایەتییان دەکرد. هەواڵی دەستبەرسەرکردنی لەیلا بۆ ئەوان، مژدەیەک بوو و لە ئاسمانەوە باریبوو، دڵخۆش بوون پێی و ئەوەندەی تریشیان پێوە دەکرد. ئەو شەوە شتێک بە ناوی ڕاستگۆیی لە ئارادا نەبوو و منیش قینم لە هەموو ئەو شتانە هەڵدەگرت کە بە جۆرێک لە جۆرەکان پەیوەندییان بە کۆمەڵگەکەمەوە هەبوو. تا سەرئێسقان ڕقم لێی بوو.

جەستەی کفت و ماندووم کە دوو شەو تامی خەوی نەکردبوو، دارما و کەمێک خەوتم. لەنێوان خەو و بێداریدا بووم و کاتژمێر نزیکەی دەی بەیانی بوو کە لەیلا تەلەفۆنی کرد.

بە دەنگێکی هیلاکەوە پێی گوتم: بەیانی باش هوزام!

منیش بە دەنگێکەوە کە لە ماندوویەتییان وەخت بوو ببڕێت، گوتم:

– لەیلا! ئێستە لە کوێی، چیان لێ کردی؟

– تکایە هاوار مەکە هوزام، تا وەڵامی پرسیارەکانت بدەمەوە. لە دوێشەوەوە خەو نەچووەتە چاوم و هێشتاش ژاوەژاوەکەی لە سەرمدایە و وەختە بتەقێ.

– پێم بڵێ ئێستە لە کوێی؟

– من لە ماڵم هوزام، خەمت نەبێ.

– سەلامەتی؟

– باشم، بەڵام زۆر ماندووم.

– چیان لێ کردی؟

– هیچیان نەکرد هوزام، پەیوەندییان بە خێزانەکانمانەوە کرد و هاتن بمانبەنەوە. وەک بڵێیت منداڵ یان کۆمەڵێک گێژ بین!

– ببوورە کە چوومە لای باوکت لەیلا، بەڵام هیچی ترم بە بیردا نەهات. زۆر خەمی تۆم بوو و خۆنەخوازانە خۆم لە بەردەم ماڵتاندا بینییەوە!

– پێویست بە داوای لێبووردن ناکا هوزام، ئەسڵەن کارێکی باشت کرد. ڕاست دەکەی، پەشیمانم لەوەی کە بە باوکمم نەگوت، چونکە دەترسام ڕێگەم نەدا و بیرم لەوە نەکردەوە کە پاش ئەوەی دەزانێ بێ پرس و مۆڵەتی ئەو کارێکی وام کردووە، هەڵوێستی چۆن دەبێ. بیرم دەکردەوە کە شایەنی ئەوەیە لەپێناویدا سەرکێشی بکەم، خۆم لەپێناو ئافرەتانی وڵاتەکەمدا بکەمە قوربانی.

– هەر دەمزانی کە پەنجەی پەشیمانی دەگەزی لەیلا، بەڵام نەمویست ڕێت لێ بگرم.

– پەشیمان نیم کە بەشداریی خۆپیشاندانەکەم کرد، پێشم وا نییە ڕۆژێ لێی پەشیمان بم، بەڵکە داخی ئەوەمە کە پرسم بە باوکم نەکرد، دەبوو پرسوجۆیەکی لەگەڵ بکەم، چونکە ئەمە پەیوەندیی بە من و هەموو ئەو ئافرەتانەوە هەبوو کە دوێنێ بەشدارییان کرد.

– ئێستە چی؟

– وا بزانم دەرگەی دۆزەخ خراوەتە سەر پشت! ئەوەی دوێشەو، تەنیا سـەرەتایەک بوو هوزام! دڵنیام کە دامودەزگا و هەرێم، هەندێ یاسامان بۆ دەردەکەن.

– گەر دەزانی چەند لەسەرت دەکەوێ لەیلا!

– هوزام، واز لەمە بێنە، خۆپیشاندانەکەت تەسویر کرد؟

بە شڵەژانەوە پێم گوت:

– نەمتوانی لەیلا، سـەیارەکانی پۆلیس چواردەوریان گرتم و نەمتوانی!

بە هیوابڕاوییەوە گوتی:

– سەیارەکانیان دەوری ئێمەشیان دا و بەرەو بنکەشیان بردین، کەچی هەر ملمان نەدا هوزام!

– من ملم نەدا لەیلا، بەڵام دەمزانی کە بێهوودەیە تەسـویری خۆپیشـاندانەکە بکەم، چونکە دەمزانی پۆلیس دەمگرێ و ئاخری تەسویرەکەش دەسڕنەوە. دەوریان دابووم!

– تا کەی ترسنۆکانە وەک مشک لەم کونەت نایەیتە دەر هوزام؟ بڕوا بکە تا ژیانت بەو جۆرە پڕ لە ترس و لاوازی و دابونەریت بێ، هیچ مانایەکی نابێ!

– هەست دەکەم لەم وڵاتە سەری خۆم هەڵدەگرم و دەڕۆم لەیلا. چیتر ناتوانم تێیدا بژیم.

– کەوایە بڕۆ هوزام، بڕۆ و خۆت بدۆزەرەوە. تا نەگەیتە حەقیقەت، سەر بێرەدا نەکەیتەوە.

– بەڵێن بێ لەیلا، تا ئازاد نەبم، ناگەڕێمەوە.

دوای هەشت حەفتەیەک ڕۆیشتم. نامەم بۆ ڕۆژنامەیەکی عەرەبی نارد کە لە لەندەن دەردەچوو. وتار و ڕاپۆرتی ڕۆژنامەیی و ژیاننامەی گەنجێکی وێڵی بیستوشەش سالانم بۆ ناردن. گەنجێک کە بەشوێن وابەستەییەکی ڕاستەقینەدا وێڵە، وابەستەییەک کە لەق نابێت و نامرێت، وابەستەییەک کە دەسدرێژیی نەکرێتە سەر.

پاش چەند ڕۆژێک وەڵامیان دامەوە و وەرگیرام، وازم لە کارەکەم هێنا. بێ ئەوەی خێزانەکەم ئاگادار بکەمەوە کە نیازی ڕۆیشتنم هەیە، کەوتمە تەواوکردنی ڕێکارەکانی سەفەر. جا لە بیستونۆی بەفرانباری ١٩٩٠دا، بە فڕۆکە بەرەو لەندەن چووم. هەموو شتم لە دوای خۆمەوە جێ هێشت، خێزانەکەم، نیشتیمان، جەنگی وێرانکەر، لەگەڵ لەیلای دایکسالارم! ئەو ڕۆژە، بێ ئاوڕدانەوە و ماڵئاواییکردن لە کەس، ڕۆیشتم.

ئۆغرم کرد و بڕیارم دا ڕابردوو بە با بدەم، چونکە لە بەفرانباردا هەموو خەونەکان کۆتاییان دێ و لە کانوونی دووەمدا خەونێکی نوێ دەست پێ دەکات. ئاخر لە کانوونی دووەمی ١٩٩١دا دەستم بە ژیانێک کرد کە هیچی لەوەی پێشوو نەدەچوو.

***

من تا سەرئێسقان لەگەڵ کانوونی دووەمدام، پیاوێکم کە ڕقی لە کۆتاییەکانی ساڵە و عاشقی سەرەتاکانییەتی. پیاوێک کە لە کانوونی دووەم و شوباتدا لە خۆشیان باڵ دەگرێت، بەڵام لە تشرینی دووەم و بەفرانباری هەموو ساڵێکدا خەموخەفەت باڵی بەسەردا دەکێشێت و تەنیا دەکەوێت.

هەست دەکەم تا ئەم ساتەش نەمتوانیوە کۆتایی ١٩٩٠ تێپەڕێنم وێڕای بەڕێکردنی دوو دەیە کە تێیدا بە چەندان هیوابڕاندا گوزەرم کرد، کەچی هێشتا نائومێدی ناخی تەنیوم. ڕەنگە لەیلا یەکەم ئافرەتی

ژیانم بێت کە هەرگیز نەتوانم لەبیری بکەم، بەڵام ئەو ئافرەتە بێگانەیەی کە لە شوباتی ۲۰۰۹دا هاتە ژیانمەوە، بێ چەندوچۆن عیشقی ژیانمە! نازانم هاتنی ئەم ئافرەتە لە مانگی شوباتدا، پشتڕاستکردنەوەی بیروباوەڕەکانی پێشوومە، یان ئەوەتا عیشق تەنیا لە شوباتێکی بەجۆشدا لە دایک دەبێت؛ مانگی عاشقان.

بەڵام ئێستە زوو زوو خەموخەفەت شاڵاو دێننە ناخم. تا زیاتر لە کۆتایی ساڵ نزیک بینەوە، زیاتر هەست دەکەم ترس خەریکە دەمخنکێنێت. دڵم هەواڵی داوە کە لە بەفرانباردا ون دەبێت، وەک شارێکی جادویی، کە شەوێک دەردەکەوێت و بۆ شەوی دواتر شوێنبزر دەبێت. من پیاوێکم ماندووی دەستی کۆتایی و سەرەتاکانم، پیاوێک کە دەیەوێت بێ هەبوونی کۆتاییەک، داسەکێت، بەبێ ماتەمی بەفرانبار و شادیی کانوونی دووەم. پیاوێک کە ئیتر دەبێت بژی و یاری بە چارەنووس نەکات، وەک چۆن هەڕەمەکیانە بیست ساڵ یاریی لەگەڵ کرد و بە درێژایی ئەو کاتە گوێی بە سوپرایزەکانی نەدا.

نازانم بۆ وام، بەڵام ئەم جارەیان چارەنووس هەترەشی بردووم.

هەست دەکەم بۆیە لێی دەترسم، چونکە خۆشەویستەکەشم ئافرەتێکە لە هەناوی چارەنووسەوە هاتووەتە دەر، باشتر بڵێم، تاقانەکچی یاسایی چارەنووسە. هەر لەبەر ئەمەشە هەست دەکەم هەر کات بێت، دەتوانێت لە منی دابڕێنێ و بە بەرچاومەوە بزری بکات. دەتوانێت دووری بخاتەوە، یاخود لێمی بسەنێت.

کە باسەکە دێتە سەر ئارەزوو و پێویستی، دەبێت بڵێم کە هەمیشە بڕوام بە فەلسەفەی *گاستۆن باشلار*[1] هەبووە. باوەڕم وا بوو کە ئەوە

---

۱. gaston bachelard (۱۸۸٤-۱۹٦۲): فەیلەسووفێکی فەڕەنسییە، زیاتر لە بواری جوانی و فەلسەفەی زانستدا کاری کردووە. «جوانییەکانی شوێن» ناونیشانی یەکێک لە گرنگترین کتێبەکانی ئەوە کە لە ساڵی ۱۹٥۸ بڵاو کراوەتەوە. «و. ک»

ئارەزووە جڵەوی مرۆڤ دەکات نەک پێویستی، بەڵام هەنووکە هەست دەکەم کە هێندەی پێویستم پێیەتی، هێندە ئارەزووی ناکەم. هاوزەمان بۆم یەکلا بووەتەوە کە ئەم پێویستییە منی دیل کردووە، جڵەوی کردووم و بە دڵی خۆی هەڵم دەسووڕێنێ. ئەمڕۆکە دەزانم کە قوناغی ئارەزووم خراپ تێپەڕاندووە، دەزانم کە چەندێک پێویستم پێیەتی و تا چ ڕادەیەکیش تێگەیشتنم لەبارەی چەمکی پێویستی و ئارەزووەوە گۆڕاوە! ژیان بۆ هەردووکمان جگە لە قومارخانەیەک هیچی تر نییە، کۆمەڵێک سەرکێشیی یەک لە دوای یەک، گرەوی جیاواز جیاواز، ڕوخساری نوێ، دۆڕانی کتوپڕ و بردنەوەی دوودڵانە. ژیان ئافرەتێکی ناپاکیکەرە کە هەر ڕۆژەو خۆشەویستێکی هەیە، ئافرەتێکی ڕاڕا کە ئەسڵەن بڕوای بە خۆشبەختی نییە، بەڵام ئێمە ڕێک کەوتووین کە هیچ شتێک نەمانترسێنێ، نە چارەنووس زراومان بەرێت و نە داهاتووش هیلاکمان بکات. جا بۆیە، هەوڵ دەدەم زۆر بیر لەو شتە نەکەمەوە کە تووشی دەبم و خۆم لەم گێرەوکێشەیەی چارەنووسەوە نەگلێنم.

بیرمە یەکەم دیاری کە پێی دام، بەردەزار بوو. لێم پرسی چ مانایەک لە پشت ئەم دیارییەوە هەیە، بیرمە خەندەیەکی تەمومژاویی کرد و وەڵامی نەدامەوە. ئیدی لەو ڕۆژەوە لێم نەپرسییەوە، چونکە هیچ یەکێکمان حەزمان بە پرسیاری دووبارە نییە، هاوکات چونکە هەردووکمان زۆر مەزاجیین و پاتەکردنەوەی پرسیاریش هەم جوانییەکەی دەکوژێت، هەم مەزاجی ئێمەش تێک دەدا.

بەڵام هەموو جار کە دوورییەکەی توول دەکێشێت، سەیری دیارییەکەی دەکەمەوە. دوو زارەکە کە لە کریستاڵی ڕووت دروست کراون، هەڵدەدەم و چاودێریی ژمارەکان دەکەم کە بەردەوام و جار لە دوای جار، دەگۆڕێن. هەست دەکەم ژیانی منیش شتێکی لەو چەشنەیە، بەردەوام بارودۆخەکانی گۆڕانکارییان بەسەردا دێت.

ئەویش لە زارەکان دەچێت، دەگۆڕێت و لەسەر یەک ڕەوت ناڕوات. هەموو ڕۆژ دوودڵی و کەلکەڵەی جیاواز. لەگەڵ ئەوەشـــدا دەزانم کە هەرگیز شەرمەزارم ناکات. من مرۆڤێکم بڕوام وایە کە شەرمەزارکردن جگە لە ڕەفتـارێکی نێرانەی ڕووت هیچی تر نییە. ئەوە بەس ئێمەین کە خۆمان شـەرمەزار دەکەین، بەڵێ خۆمان شـەرمەزار دەکەین، هەر ئێمەشـین کە ئافرەتان شـەرمەزار دەکەین. هەر لەبەر ئەمەیە کە قەت لە ئافرەتـان ناترســـێم. پیاوێکم لێیان نەتۆقیوم، چونکە کاتێک خێزان شـەرمەزاری کردم، هۆزەکەم منیان فرۆشـت و نیشـتیمان ناپاکیی لێ کردم، تەنیا و تەنیا دەسـتی پیاوانی تێدا بوو و ئافرەتان لەم نێوەندەدا هیچ کاریگەری و دەسـەڵاتێکیان نەبوو. وەک پیاوێک ژیانم بەڕێ کرد کە جگە لە پیاوان، کەسـی تر شـەرمەزاریان نەکرد، جا چی لە ستەمی پیاوانیش قێزەونتر!

زۆر کەیفم بەوە دێت بیر لە مەبەستی پشت ئەو دیاریانە بکەمەوە کە بۆمی دەهێنن، چونکە هەر دیارییەک لە خۆیدا چیرۆکێکە و، هەموو دیارییەکیش پەیامی خۆی هەیە. بەڵام زۆر بیر لە مانای ئەو شـــتە نـاکەینەوە کە دەیکەنە دیـاری بۆمـان. لە جەژنی دایکـانی ســـاڵی ڕابردوودا، بازنێکی ئاڵتوونیی ناســـک کە بە تایبەت لە بەیرووتەوە داوام کردبوو، بە دیاری پێ دا. لەســـەر بازنەکە بە پیتگەلێکی جوانی عەرەبی نووســـرابوو «من». ئەوی ڕۆژێ ئەو وا گومـانی کرد کە مەبەستم لەم «من»ــــە خۆم بووە! وای بۆ چووە وشـەی منم بەکار هێناوە، تا ئاماژە بە خۆم بدەم، چونکە ناوی یەکتر نازانین. بەڵام ئەمە لە مەبەستی منەوە زۆر دوور بوو، چونکە مەبەستی من لەم «من»ـە خودی ئەو بوو، تا هەمیشە بیر لە خۆی بکاتەوە و ئەوان و ئەو لە بیر بکات. تەنیا بیر لە خۆی بکاتەوە، تەنیا لە خۆی.

ئەو ڕۆژە زۆر بەم بیرۆکەیەم پێکەنی کە لە جەژنی دایکاندا دیاریم بۆ کڕیوە. منیش بۆم ڕوون کردەوە کە چەنـدە حەز دەکەم هەموو

ئافرەتێک لە جەژنی ئافرەتاندا پیرۆز ڕاگرم، چونکە جەژنی دایکان تەنیا تایبەت نییە بە دایکان، بەڵکە جەژنی هەر ئافرەتێکە کە جەستەی هۆرمۆنی ئیستروجین دەر دەدات. بە تاسەوەم کە هەموو ئافرەتێک بەرز بنرخێنم، چونکە پیاوێکم ئافرەتم لا پیرۆزە، نە دەیانخەڵەتێنم، نە سووکایەتیشیان پێ دەکەم.

ئەمڕۆ هەنگاوە خاووخلیچکەکانم بەرەو نیوەی دەیەی چوارەمم هەڵدێنم. جگە لە هەزاران وتار، چوار ڕۆمان و چەندسەد هەزارێک لە هەژمارە بانکییەکەم و بڕوانامەیەکی دکتۆرا، هیچم بە هیچ نەکردووە. ئەمڕۆکە خەریکە ڕۆمانی پێنجەمیشم تەواو دەکەم. پیتەکان کەوتوونەتە کێبڕکێ تا تەواوی بکەم و هورووژمی بیرۆکەکانیش ماندوویان کردووم. ڕستە و وشەکان وەک کۆمەڵێک ئەسپی بەلەسە غار دەدەن و کەس ناتوانێت جڵەویان بگرێت و خۆشیان دڵیان بە وەستانەوە نییە. هەست دەکەم تاکە نووسەرم هەوڵی خاوکردنەوەی بیرۆکەکانم دەدەم، ناشزانم بۆ بەردەوام وام!

ئێستە دەزانم کە کتێبەکان تەنیا لەگەڵ نائومێدیدا لە دایک دەبن، ئەوە تەنیا نائومێدبوونە لە چارەنووس کە بەرەو نووسین پاڵمان پێوە دەنێت. منیش خەریکە لەم سرووتی نووسینە وەڕەز دەبم، چیتر نووسین سەرنجم ڕاناکێشێت و وەک جاری جاران برسیی پیتەکان نیم. ئاخر کتێبەکانم تەنیا لەگەڵ لادانەکانمدا یەک دەگرنەوە و پیاوێکی وەک منیش کە پڕاوپڕم لە سەرەڕۆیی، چیتر خەمەکانی دڵنەوایی نادەنەوە.

ئەو ڕستەیەی *عەلوان سومەیمیم* بەرچاو کەوتەوە کە لەوەتەی خوێندبوومەوە، لە یادگەمدا بە نەمری مابووەوە. عەلوان لە کتێبە کەموێنەکەیدا (*زەوی کەسی خۆش ناوێت*) دەڵێت: *کارەساتەکانی دوارۆژ دووبارە دەبنەوە*. عەلوان درۆی نەکرد، چونکە کاتێک تووشی کارەساتێک دەبین، ئیدی قیامەتی دونیایی هەڵدەستێت و کاتێکیش

دەوەستێتەوە، بۆ ئەوەیە هەناسەیەک بدەینەوە و خۆمان بۆ قیامەتێکی تازەتر ئامادە بکەین.

ئێستاکە دەزانم کەماڵئاوایی لە خەمێک دەکەین، تا بەخێرهاتنی دانەیەکی تر بکەین. بەختەوەریش تەنیا مەودایەکی کاتییە کە خەمێک لە یەکێکی تر جیا دەکاتەوە. ژیان دزێوە، لەگەڵ مرۆڤە ژیرەکاندا بەدفەڕە، وەک بلێیت لەپای هەوڵدانیان بۆ تێگەیشتن لە ڕازەکانی، سزایان دەدات. ژیان تەنیا سزای ئەوانە دەدات کە بەشوێن نهێنییەکانیدا دەگەڕێن، تەنیا ئەمانە و کەسی تر نا. لە بەرانبەردا لەگەڵ هەموو مرۆڤە ڕووکەشی و گێژەکاندا هاوسۆزە، دڵخۆش و ڕێنوێنییان دەکات و هەرگیز داواکانیان ڕەد ناکاتەوە، چونکە هەرگیز نەیانوێراوە بە ڕوویدا بوەستنەوە. ئێستە دەزانم کە ژیان بە منەوە گرتوویەتی، یەکێکم لەوانەی کە چێژ لە ئەشکەنجەدانیان دەبینێت. ژیان تا دوورترین سنووری ئاسمان بەرزم دەکاتەوە، جا بەرم دەداتەوە سەر عەرد، تا دڵخۆش بە ئازارەکانم، نەگیریسانە پێم پێبکەنێت.

پیاوێکی وەک من، دەزانێت کە زۆر لەوە لاوازترە ئاڵنگاریی چارەنووس بکات. دەزانێ کە جەنگی ئەو لەگەڵ چارەنووس بە شکست کۆتایی دێت و هەموو ئاڵنگارییەکانی پێشووتریشی، تەنیا کۆمەڵێک هەوڵی «نێرانە»ی بەستەزمانانە بوون. چارەنووس هەر وا باڵادەست و ستەمکار دەمێنێتەوە و تۆیش شەهیدێکی زیندووی کە هەر بە ڕاستی نازانیت کەی چارەنووس دڵی پێت دەسووتێت و دواهەمین فیشەک بە تەپڵی سەرتەوە دەنێت و ئەرخەیانت دەکات.

من دڵتەنگم، هێندە دڵتەنگم نەبێتەوە! بەزۆریش لە کاتی نووسینی کتێبێکدا تووشی ئەم دڵتەنگییە نابم. ئاخر من هەردەم عاشقی قۆناغی نووسینم، پیاوێکم چێژ لە ورد و درشتی ئەو قۆناغە پڕووکێنەرە دەبینم کە پڕاوپڕە لە هیلاکی، ئازار و هەستی دژبەیەک، بەڵام، هەر ئەوەندەی کتێبەکەم چاوی بە دنیا هەڵهێنا، دڵتەنگیی دوای نووسین

«ساوا»کەم هەڵدەگرم کە ...
لێم دەدا. بە ڕادەیەک ڕق لە کتێبە هەڵاهەلا بکەم. وەلێ ئەم دەکەم لەناوی بەرم و یەک یەک هەمووی هاتە مانگی سەرماوەرز جارەیان دڵتەنگییەکە زووتر دەستی پێ کرد. و پێش ڕۆمانە تازەکەشم کەوت. نازانم تا کانوونی دووەمی دواتر، یاخود تا کاتی بڵاوبوونەوەی ڕۆمانەکەم خۆم دەگرم یان نا.

هەست دەکەم ژیانم هەمیشە بێهوودە بووە، دەزانم کە هیچ شتێ لە دوای خۆمەوە جێ ناهێڵم. ئافرەتێکی عاشق لە پاش خۆمەوە جێ ناهێڵم، یاخود منداڵێک کە بەشێک لە منی هەڵگرتووە، یانیش خێزانێک. هیچ نیشتیمانێکیش پاش جێهێشتنی، بیرم ناکات، من لەم دنیایە دەڕۆم و تەنیا وشەکان لە دوای خۆمەوە جێ دێڵم، تەنیا وشەکان. وای لە سەختیی باجی وشەکان!

وەک سوقرات لە سەرەمەرگدا دەیگوت، ژیان بۆ من تەنیا نەخۆشییەکی کوشندەیە. ناشزانم کە چۆن هاتوومەتە ئەم گێچەڵووکەوە! ڕەنگە ئەو منی پەلکێشی ئەم گێچەڵووکی دڵتەنگییە کردبێت. دوورییەکەی درێژەی کێشا و وەختە لە بەینم بەرێ. ئەوەی خۆشەویستی بەسەرمانیدا دێنێت، هیچ شتێکی تر بەسەرمانیدا ناهێنێت. هێشتاش حاڵی ئەو دۆستەمم لە بەرچاوە کە بە ناچاری لە هاوسەرەکەی جیا بووبووەوە. بیرمە کە چۆن هەموو دوو خوولەک، سێ خوولەک جارێک سەیری مۆبایلەکەیی دەکرد و ئاواتەخواز بوو نامەیەکی بۆ هاتبێت. بە درێژایی کات خەیاڵی دەنگی مۆبایلەکەی دەکرد. لە خەو ڕادەچڵەکی و وای دەزانی تەلەفۆنی بۆ هاتووە. سوێندنی دەخوارد کە گوێی لەو ئاوازەی مۆبایلەی بووە کە تایبەت بووە بە هاوسەرەکەی، بەڵام هەموو جار بێدەنگیی مۆبایلەکە دەیتاساند. ئەم هاوڕێیەم، یەکێکە لە شەهیدەکانی عیشق و قوربانییەکانی کۆمەڵگە. ئەم پیاوە وای لێ کردم بۆ ماوەیەکی درێژ ڕق لە خۆشەویستی هەڵبگرم. هەر جارێ ئەوم لەو حاڵەدا دەبینی، بۆ

ماوەیەکی زۆر سێکسم لەگەڵ ئافرەتان نەدەکرد، چون دەترسام شتی لەو دەردەی ئەوم تووش ببێت. تەماشـــاکردنی ئەو، کە بێئومێدانە فرمێسـکی عیشـقی دەباراند، دڵی مرۆڤی دەکرد بە ئاو. بیرمە نامەی بەتاڵی بۆ دەنارد، بیرمە کە فرمێسک لە چاوانی قەتیس دەما کاتێک بە نامەیەکی بەتـاڵ، وەڵامی نـامەکەی دەدرایەوە، نـامەیەک کە تەنـانەت یەک پیتیشـی تێدا نەبوو! بە درێژایی ڕۆژ نامەی بەتاڵیان دەگۆڕییەوە، ئەم بۆی دەنارد و ئەویش وەڵامی دەدایەوە، بۆی دەنارد و ئەویش بە بێدەنگییەک کە تەنیا ئەو لێی تێدەگەیشت، وەڵامی بێدەنگییەکەی ئەمی دەدایەوە.

لە چێشـــتخانەیەکدا نانی ئێوارەمان دەخوارد، کاتێک نامەیەکی بۆ هات. ئێستەش بیرمە کە چۆن سەری نایە سەر مێزی نانخواردنەکە و کەوتە هەنسکدان! ئەم دارمانە کتوپڕەی منی ترسـاند، مۆبایلەکەم لێ سەند و بینیم نامەیەکی بەتاڵە. بە سەرسووڕمانەوە لێم پرسی:

– ئەم نامە بەتاڵە واتە چی؟

ئەویش بەدەم بەرهەڵستیکردنی فرمێسکە بەسوێکانییەوە گوتی:

– هەر کە بیری دەکەم نـامەیەکی بەتـاڵی بۆ دەنێرم، ئەویش کاتێ بیرم دەکا نامەم بۆ دەنێرێ. کەمێ پێش ئێســـتە نـامەیەکم بۆ نـارد چونکە زۆر زۆر بیرم دەکرد، ئەویش بە دوو نـامەی بەتـاڵ وەڵامی دامەوە!

– دوو نامە یانی چی؟

– وا بزانم ئەو زیاتر بیرم دەکا!

بۆ شــــەوەکەی، بەئاوات بووم کە بمتوانیبا داروونەدارم لە ژیاندا بکەمە قوربانی بەس بەو مەرجەی خۆشەویستەکەی بگەڕێتەوە. هەر ئەو شەوە زانیم کە چەندە سەختە سەیری دابڕانی دوو عاشق بکەین، چ کارەســـاتێکە کە دوو عاشـــق بە ناچاری لە یەکتر جیا ببنەوە و

ئێمەش نەتوانین دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکەین. هەر ئەو شەوە ڕووم لە قیبلەی بەختەوەری و عیشق وەرگێڕا و تا ئەو کاتەی «ئەو»م ناسی، ئەم متمانەیەم بۆ نەگەڕایەوە. دەترسم چارەنووس ئەو شتەم لێ بستێنێتەوە کە بەم دواییانە بەدەستم هێنایەوە، چونکە باش دەزانم کە گەر ئەم جارەیان بڕوام بە عیشق نەمێنێت، ئەوە هێز نییە بتوانێت دووبارە وام لێ بکات بڕوای پێ بهێنمەوە. دەزانم کە ئیدی دەست لە سۆزداری دەشۆمەوە و دوای ئەوەش کە دەستم لێ شتەوە، پێم وا نییە بتوانم بەردەوامی بە ژیان بدەم.

لەو شەوە بەجۆشەدا چوومە شوقەکەمان و لەسەر ئەو قەنەفەیە ڕاکشام کە لە دواهەمین شەوی عیشقدا، باوەشی بە جەستەماندا کردبوو. قەنەفەکە بۆنی ئەوی لێ دەهات، منیش وەک ئەوەی لە پەنا، یاخود بە دەورمەوە بێت، بۆنەکەیم هەڵدەمژی. جا نازانم کە هەر بە ڕاستی بۆنەکەی لەوێ مابووەوە یان منیش وەک برادەرەکەم کە خەیاڵی ئاوازی هاوسەرەکەیی دەکرد، تووشی خەیاڵات بووم.

ئەمڕۆکە زۆر لەو عیشقە تێدەفکرم کە لە تاسە و هیوادا، دەمانگەیەنێتە سنووری وەهم! بیر لەو عیشقە دەکەمەوە کە لە ماوەی دوو دەیەی تەمەنمدا، لەگەڵ دەیان ئافرەتدا نووستم، کەچی منی کردە دیلی تەنیا یەک دانەیان. ئافرەتێک کە پێم وایە هەموو ئافرەتانی دونیا دێنێت و جێی هەموویانی پڕ کردووەتەوە.

من پیاوێکم کە تووڕە دەبم، وشەکان لە ناخیدا یاخی دەبن. دەڵێن پیاو بە جگەرەکێشان و سێکس و خواردنەوەی کحوولی ڕقی خۆی هەڵدەڕێژێت، بەڵام من تەنیا بە خۆشەویستی و نووسین دەری دەبڕم. بەس گەر ئەم جارەیان عیشق هۆکاری یاخیبوونم بێت، ئەوا بە چ شتێک ئەم ئاهی سینەیە دەرببڕم؟

جار نا جارێک ئەو پاوەندە دەردەهێنم کە لە جەژنی پارساڵدا پێی دام. وەک شوێنەوارێکی پیرۆز، دەستی لێ دەدەم.

ئەوی ڕۆژێ لە شـوقەکەماندا بووین، چلێسـانە چوکلاتەمان دەخواردەوە و هێشـتا لەسـەر قەنەفەکە ڕاکشـابووین. ئەوکات تەنیا دوو منداڵ بووین کە لەسـەر قەنەفەیەک ڕاکشـابوون و زارۆکانە قاچیان بەرەو مێزەکەی بەردەم درێژ کردبوو. بەدەم لێسـانەوەی چوکلاتەی پەنجەکـانمەوە پێم گوت: «دەزانی ئەمە یەکەم جەژنی ئایینییە کۆمان بکاتەوە؟»

لە کورسییەکەی تەنیشت، جانتا دەستییەکەی ڕاکێشا و پاوەندێکی دەرهێنا، جا بۆمی ڕاداشت و گوتی: «بیرم چووبوو کە ئەمڕۆ جەژنە، کەوایە جەژنت پیرۆز!»

پێکەنیم و منیش لە جزدانەکەم پـاوەنـدێکم دەرهێنـا و پێم دا: «هەموو ڕۆژ لە شادیدا بی!»

ئەو ڕۆژە زۆر پێکەنینم بە «جەژنـانە»کەی هـات، بەڵام گەلێ بە پـاوەنـدەکەی دڵخۆش بووم و خسـتمە گیرفـانێکی شـاراوەی جزدانەکەمەوە، ئەویش پاوەندەکەی منی لە جانتاکەیدا شـاردەوە. ئەو ڕۆژە هەسـتمان دەکرد تەنیا بە دوو پاوەند، بووینەتە خاوەنی هەموو سـەروەتی دونیا، وەلێ هەموو جار کە دابڕانەکەی درێژە دەکێشـێ، دەترسم کە جگە لەو پاوەندە، هیچی ترم لەوەوە بۆ نەمابێتەوە.

عیشـق ئەو دیارییە خودابییەیە کە ناکڕرێت، عیشـق حاڵەتێکی ڕۆحانییە، حاڵەتێک کە شـانازیمان تا ئەوپەڕی سـنوور دەفڕێنێ، شانازیمان دەگاتە ئاستێکی نەزانراو. لە عیشقدا، هەست بە پیرۆزی دەکەین، پیرۆزییەکی بێرادە. هەسـت دەکەین خەرمانەیەکەی سـپی دەورەی داوین و خودا توند توند باوەشـی پێماندا کردووە و ژیانیش زۆر لەوە جوانترە کە تەنیا وێسـتگەیەک بێت. لە هەموو چیرۆکێکی عاشقانەدا، هەست دەکەین یەکەم جارمانە عاشق بین، مەست دەبین، وەک بڵێیت یەکەم جارمان بێت مەست ببین، بەڵام عیشق سەختە، تا

بڵێیت سەختە! تەمەنم هەڵکشا تا بەرگەی خۆشەویستییەکی وا بێدەنگ بگرم، وەک ئەو خۆشەویستییەی کە منی بەوەوە بەستووەتەوە.

ئەو حاڵەتێکی سەیرە، ئافرەتێکی دانسقەیە. ئامادەییەکەی بەجۆشە، بە شانازییەوە دەدوێت، ئافرەتێکی دڵنیا، کاریگەر و بەهێزە. ئافرەتێکە چارەنووس بۆ منی نارد، لە کاتێکدا کە چاوەڕێی هیچ سوپرایزێک نەبووم لە چارەنووسەوە. ئەم هاتنە کتوپڕەی سەری لێ شێواندم و زیاتر خستمییە گومانەوە.

هەر ئەم سەرلێشێوانەیە کە منی وا لێ کردووە، پیاوێکی مەزاجی، سیخناخ لە دژیەکی و هەڵبەزودابەز بم، وەلێ دەردەداری ئەوم و هیچ شتێکیش چارەی ئەم دەردەم ناکات. هەست دەکەم مەزاجیبوونم نەفرەتێکە کە دوای جێهێشتنی نیشتیمان تووشی هاتم، نیشتیمان ئەو پارچە خاکەیە کە نەفرەت لە هەموو جوا نییەکانی دەکات، وەک چۆن نەفرەت لە هەموو ئەوانەش دەکات کە جێی دەهێڵن. تەنیا دوو بژاردەمان لە بەردەمدایە، یان ئەوەتا لە نیشتیماندا ئازار دەچێژین؛ یان دوور لە نیشتیمان. وەلێ من بەنیئادەمێکم بێز لە نیشتیمان دەکەمەوە، زۆریش بێزی لێ دەکەمەوە و مادام لێیەوە دوورم، ئامادەم بەرگەی هەموو نەفرەتەکانی دونیا بگرم. هیچ شتێکیش من بە ئەو، یان بە شتێکی ناویەوە نابەستێتەوە.

پێش هاتنی، تەنیا پیاوێکی «کەموێنە» بووم، بەڵام دوای هاتنی بوومە پەیامهێن، پەیامهێنی کە سرووشی بۆ هاتووە. پەیامهێنێک کە پێشتر جگە لە کتێب و جگەرە و پیانۆیەک کە ژیانی لەگەڵدا بەش دەکرد، هیچ شتێکی تری نەبوو.

ویلیام جەیمس[1] دەڵێ: *ئازار کلیلی داهێنان و زیرەکییە.* هەڵبەت هاوڕاییم، بەڵام ئازار کە زۆر بوو دەمانخنکێنێت و چیتر توانای ئەنجامدانی هیچ کارێکمان نامێنێت. منیش کە ئەو لێمەوە دوور بێت، هەموو هەست و بیرۆکەکان لە ناخمدا دەشێوێن و جگە لە ئەو، ناتوانم بیر لە یەک شتی تر بکەمەوە. بە کورتی ناتوانم ئەو تاڵییە قووت بدەمەوە کە ئەوکی گرتووم!

پیاوێک کە لێوڕێژە لەم هەموو تاڵاوەی ژیان، ناتوانێت ڕووبەڕووی ئەو سەختییە ببێتەوە کە ژیان دەیهێنێتە ڕێی. ئێستە زۆر بیر لەوە دەکەمەوە کە ئەم ئافرەتە چیی لە مندا جێ هێشتووە، زەندەقم لەوەش چووە کە دەکرێت چیم تیا بچێنێت، چونکە دەزانم هەر ئەوەندەی کتوپڕ جێی هێشتم، ئیدی هیچ شتێک تاهەتایە ناتوانێت جێی پڕ بکاتەوە.

لە ژیانی هەر یەکێکماندا، داوێک هەیە کە ئێمەی بە ژیانەوە بەستووەتەوە، بەڵام هەر کە بەندی ئەم داوە پسا، ئیدی حەز ناکەین هەناسە بدەین، لە خەو بێدار بینەوە، بیر بکەینەوە و بژیین! هەر ئەم داوەیە کە منی بە زیندوویی هێشتووەتەوە، کەوایە چۆن ژیان بگوزەرێنم بێ ئەوەی بەستەرێک منی بەوەوە بەستبێتەوە؟

نامەیەکم بۆ نووسی و لە گیرفانی پاڵتۆکەمدا هەڵم گرت، وتم بەڵکە ڕۆژێک ناونیشانەکەی بدۆزمەوە و بۆی بنێرم. لە نامەکەدا نووسیم: «بۆچی ناگەڕێیتەوە؟»

---

١. William James (١٨٤٢-١٩١٠): فەیلەسووف، مێژوناس و دەروونزانێکی ئەمریکییە. ویلیام جەیمس بە یەکێک لە گرنگترین فەیلەسووفەکانی کۆتایی سەدەی ١٩ی ئەمریکا دادەنرێت. جیا لەمە و لەپای ئەو هەوڵ و ماندووبوونانەی کە ئەم فەیلەسووفە لە بواری دەروونزانیدا خستبوونییە گەڕ، ناوی باوکی دەروونزانیی ئەمریکیی لێ نرا. «و. ک»

بەڵام نامەکە هەر وا مایەوە و گیرفانمی جێ نەهێشت. دڵیشم هەر وا ناڵاندی، لە ئازاردا ترپەی هات و لە حەسرەتان فرمێسکی باراند: «بۆچی ناگەڕێیتەوە؟»، وەلێ جگە لە دەنگدانەوەی ئەم ڕستەیە، هیچ وەڵامێک نەبوو. کات دامان دەبڕێنێت و منیش جگە لە ڕۆژەکان و ئەوانەی کە وەک «من» گازندەی دابڕانیان کرد و وەڵام نەدرانەوە، نەمزانی یەخەی کێ بگرم!

***

لێرە و لەوێ ئەو شتانە دەخوێنمەوە کە لەیلا لە ڕۆژنامەیەکی سعوودیدا دەیاننووسێت. وێنەکەی بەسەر پەڕەی ڕۆژنامەکانەوە دەبینم کە سەرکەوتووانە پێدەکەنێت، وەک بڵێیت لە ڕێی وێنەکەیەوە -کە ئەوە تەنیا چەند ساڵێکە دەتوانێت لەسەر وتارەکانی بڵاوی بکاتەوە- هاوار دەکات: «دوای ئەوەی کۆمەڵگە و یاسا بۆ دوو دەیە منیان شاردەوە، ئەوەتا ئەمڕۆ وێنەیەکی جوانم لەسەر پەڕەی ڕۆژنامەکان دەردەکەوێت.»

لەیلا کە ساڵانی دووری ئاسەواری پیربوونیان بەسەر سیمایەوە جێ هێشتووە، دوای نزیکەی دە ساڵ دەستی کردەوە بە نووسین. پاش ئەوەی بەشداریی خۆپیشاندانەکەی کرد، بۆ چەندان ساڵ دەستی لە نووسین هەڵگرت، بەڵام کە گەڕایەوە، خاوەن هەمان هەڵوێست بوو و بیروباوەڕەکانی پێشووتریشی هیچ گۆڕانێکیان بەسەردا نەهاتبوو. دەستی لە نووسین هەڵگرت و سزاش هیچی لەودا نەگۆڕی.

ڕێک سەد پلە پێچەوانە، کە گەڕایەوە، زیاتر باوەڕی بە دۆزەکەی هەبوو. بە تینوتاوێکی نەبەردانەوە هاتەوە مەیدان و سوور بوو لەسەر ئەو گۆڕانکارییەی کە هەمیشە هوتافی بۆ کێشابوو و لەپێناویدا خۆی خستبووە مەترسییەوە.

بیرمە ڕۆژێکیان لە ئابی پارسـالدا نامەی بۆ ناردم. ئەو ئیمەیلەم کردەوە کە تایبەت بوو بە ڕۆژنامە و بینیم نامەیەکم بۆ هاتووە کە ئەمە ناونیشانەکەیەتی: بزانم دەزانی! تێیدا نووسیبووی:

*ئازیزم هوزام عاسم، وتارنووسە بەناوبانگەکەی عەرەب!*

*چەندە گۆڕاوی! ئەمڕۆ وتارەکەتم خوێندەوە و بیرم لەوە دەکردەوە کە داخۆ بە مێشکی هیچ یەکێکماندا دەهات کە ئەو کوڕە لەڕە شـەرمنەی بە هەڵکەوت لە بینای ڕۆژنامەدا بیسـت سـاڵ لەمەوبەر چاوم پێی کەوت، ببێتە بەناوبانگترین وتارنووسـی عەرەب و لە باشترین ڕۆماننووسەکانیشی؟*

*بڕوات هەبێ، بە مێشکی هیچ یەکێکماندا نەهاتبوو!*

*نازانم گەر من هۆکاری سـەرەکیی گۆڕانت بووبم، بەڵام دڵنیام یەکێک بووم لە هۆکارەکان.*

*دەکرێ ئەو هۆکارانە لەبیر بکەین کە لە پشـت گۆڕانمانەوە بوون هوزام، یاخود هۆکارەکان هەر وا بە نەمری لە یادگەماندا دەمێننەوە؟*

*ئێستەش بۆ من مایەی شانازییە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە نزیکترین کەسـەکانت بووم، هەرگیزیش ئەوەم بیر ناچێ کە ڕۆژگارێ خەریک بوو ببینە خێزانێ.*

*بەهەرحاڵ، مانگێک لەمەوبەر سـێیەم منداڵم بوو، دەمویسـت ناوی تۆی لێ بنێم، بەڵام وام بە باشتر زانی ناوێکی تازەی بۆ هەڵبژێرم، بۆ ئەوەی ژیانێکی تازە دەست پێ بکات.*

*باش بە و هۆکارەکەتت لە بیر مەکە!*

***لەیلا قەندیل***

که نامەکەی لەیلام خوێندەوە، بزەیەکم کرد. بزەی خۆشی نەبوو، بەڵام ناتوانم هۆکاری پشت ئەم خەندەیە ڕوون بکەمەوە.

هەندێک یادگاری کە یادگەمان داگیر دەکەنەوە و کەسانێک کە سەر بە «ڕابردوو»مانن، کتوپڕ لێرە و لەوێ لە ژیانماندا دەردەکەونەوە، وامان لێ دەکەن بزە بکەین، هەڵبەت نە لە خۆشیدا، نە لە خەفەتیشدا، بەڵکە لەبەر ئەوەی کە شتێکی جوانی ڕابردوو، زۆربەی جاریش ناخۆش، کتوپڕ و لە کاتێکدا کە چاوەڕێ نەبووین شتێک لە دوێنێی دوورەوە بێتەوە ڕێمان، سەردانمان دەکاتەوە.

ڕەنگە لەبەر ئەوە بزەم کردبێت کە هێشتا منی لە یادە، یان دەشێ پێی شاد بووبم. دڵخۆش بووم کە بووەتە دایک و خێزانێکی پێکەوە نابوو. یان ڕەنگە بۆ ئەوە بزەم کردبێت کە پێویستم بە دەستێکی نیان بووە تا لەو ڕابردووە پڕ چەرمەسەرییەدا، بە پشتمدا بکێشێت.

ممم، ڕاستییەکەی نازانم بۆ بزەم کرد. بەڵام نامەکەی لەیلا، جوانترین نامە بوو کە لە ژیانمدا بۆم هاتبێت و نەمزانی چیی وەڵام بدەمەوە، گەنجینەی پیتەکانم بزر بوو و وشەکانیشم مایەپووچ. هەرچەندم کرد نەمتوانی شتێکی بۆ بنووسم کە ئاماژە بە ساکارترین ئەو هەستانە بدات کە ڕوون ناکرێنەوە و لە ناخمدا خول دەخۆن. دوای دوو کاتژمێر هەوڵدان، بە کورتبڕییەکی پاساونەدراوەوە بۆم نووسی:

*ئازیزم لەیلا*

*بەڵێنت دەدەمێ کە هۆکارەکانم لەبیر ناکەم و تۆش وەک نموونەیەکی گشت هۆکارەکان، لە ژیانمدا دەمێنیتەوە.*

*باش بە، ماچی منداڵەکانت و تازە لەدایکبووەکەش دەکەم.*

**هوزام عاسم**

هەر کە کتێبخانەمم جێ هێشت، بەرەو ئەو شوقەیە کەوتمە ڕێ کە من و ونبووەکەم تێیدا یەک دەبینین. پێویستم بە جێیەک بوو تێیدا هەست بە خۆشەویستی بکەم. ماڵەکەم هەرگیز گەرموگوڕ نەبووە، ئێجگار چۆڵ و ساردوسڕە، کات تێیدا خاوە، ڕێک پێچەوانەی ئەو شوێنەی کە تێیدا بە دیداری یەک گەیشتین، ئاخر ئەوێ جێیەکی بچووک و خۆشەویست و گەرموگوڕ بوو، جێیەک کە لێوڕێژ بوو لە ئێمە.

تەواوی ڕۆژەکە بیرم لای لەیلا بوو و بیرم لەو شتە دەکردەوە کە کۆی کردینەوە، لە چیرۆکەکەمان، لەوەی کە ئێستە ئەو بووەتە چی و منیش چی. بیرم لە دوو دەیەی ڕابردوو دەکردەوە، لەوەی کە چی دەبوو گەر چاوم لە برینەکەم بپۆشیبا و لەوێ بمابامەوە، ئێستە ژیانم چۆن دەبوو! یان گەر بمابامەوە، برینەکەم سارێژ دەبوو یان نا! هەندێک جار بیر دەکەمەوە دوورکەوتنەوەم لە کەسانی نزیکم، هۆکاری زێتر تووڕەبوونمە. هەستی کەسێکی ترسنۆک کە زەندەقی لە ڕووبەڕووبوونەوە چووە، دام دەگرێت و بیر دەکەمەوە کە گەر لەوێ بمابامەوە، ئەوەم تێدەپەڕاند کە ڕووی دا.

هەندێک جار هەست دەکەم تاکە هۆکاری ڕۆیشتنم ترسنۆکیم بوو، دەبوو بمێنمەوە و هەوڵی گەڕاندنەوەی ئەو شتە بدەم کە لێم سەنرابوو، نەک ئەوەی خۆم دوور بخەمەوە، یان لەپێناو ژیانێکی سەرسلامەتانەدا دەستبەرداری هەموو شت ببم. هەست دەکەم گەر بەجەرگتر بوومایە و چاونەترسانە بە ڕووی ڕووداوەکاندا بوەستابامەوە، سەر دەکەوتم، با بشمزانیبا کە ئەو شەپۆلەی من بە پێچەوانەیەوە وەستاوم نایەڵێت لە زەریای بەرین و ئاوە قووڵ و بەشەپۆلەکەیدا مەلە بکەم و ئاخری هەر دەمخنکێنێت، یاخود نغرۆم دەکات و دەمکوژێت. ئێستە لام ڕوون بووەتەوە کە مردن لە ڕێی

عیشقدا، زۆر لەوە خۆشترە کە هەموو ژیانم بە سۆزێکی شێواوەوە بەڕێ بکەم.

سەیرە کە لە یەک کاتدا بیرم لە لەیلا و ونبووەکەم دەکردەوە. ناشزانم چی کۆی کردنەوە! ئەسڵەن نازانم چۆن بیر لە دوو ئافرەت دەکەمەوە لە کاتێکدا یەکێکیان ڕەدی کردەوە لە ژیانم بچێتە دەر و ئێستە خۆشم ناوێت، ئەوی تریشیان نەیویست لە ژیانمدا بمێنێتەوە و خۆشم دەوێت.

عیشق لەو پرسە ئێجگار ئاڵۆزانەیە کە هەرگیز ناتوانین لێی تێبگەین. من تا ئەمڕۆش بیر لەوە دەکەمەوە کە پارساڵ لەنێوان مادلین و جیهاددا ڕووی دا. سەرم لەوە سووڕ ماوە کە چۆن وەک ئەوەی نە بایان دیبێت و نە بۆران، ئەو هەڵەیەیان لەبیر کرد. سەیرم لەو خۆشەویستییە دێت کە کۆی کردوونەتەوە، بەهاکەی، پتەوییەکەی.

ئەمێستاش ئەو شەوەم بیر ناچێتەوە کە مادلین بەئاگای هێنام، نزیک کاتژمێر دووی شەو بوو کە پەیوەندیی پێوە کردم. لەسەر تەختەخەوەکەم خەریکی خوێندنەوە بووم تا خەو بچێتە چاوانم، خۆمم ڕێک کردەوە و هەر ئەوەندەم زانی ژمارەکەی لەسەر شاشەی مۆبایلەکەم دەر کەوت. ئاخر گەر بۆ کارێکی زۆر گرنگ نەبوایە، مادلین لەم کاتانەدا تەلەفۆنی بۆ نەدەکردم.

گوتی:

– هوزام، لە بەردەرگام، تکایە بۆم بکەرەوە!

منیش بە سەرسوورمانەوە پرسیم:

– دەرگە! کام دەرگە؟

بە تووڕەییەوە قیژاندی:

– دەرگەی شوقەکەت هوزام! قابیلە چ دەرگەیەک!

بە پەلە لە جێگەکەم هاتمە دەر و گوتم:

– باشە باشە، ئەوە هاتم!

لە دۆلابەکەمدا بیجامەیەکی درێژم دەر هێنا و بە پەلە لە پێم کرد، جا بەرەو دەرگەکە فڕکەم کرد.

بەدەم کردنەوەی دەرگەکەوە پێم گوت: «ببوورە مـادلین، زۆر چاوەڕێ بووی؟!»

بە ئەسپایی گوتی:

– هیچ نییە، چ باش بوو کە لەم کاتەدا دەرگەت کردەوە! بەس خۆ دڵنیا بووم نەنووستووی و هەر لەبەر ئەوەش بوو کە هاتم.

قاوەگەرمکەرەوەکەم داگیرساند و پێم گوت:

– خۆشحاڵ بووم خاتوونم، پێم بڵێ، چیت لێ قەوماوە؟

بەدەم سڕینی تنۆکەفرمێسکێکەوە گوتی:

– ئەوە بۆ خلیجییەکان لەگەڵ لوبنانیدا بە لوبنانی قسـه دەکەن و لەگەڵ میسرییەکیشدا بە میسری؟

هەرچەند بەم ڕسـتەیەی دەیویسـت پەژارەی خۆی بشـارێتەوە، بەڵام وێڕای ئەوەش من هەر هەستم پێی کرد و گوتم:

– فرەبەهرەییە ئیتر!

بەدەم لابردنی دەسماڵەکەی ملییەوە گوتی:

– چ چ!

کوپێک قاوەم خستە بەردەمی و جا هاوکاتی دەستهێنان بە قژیدا، پێم گوت:

– بڵێ بزانم! گوێقوڵاغم!

هەوڵی دەدا بەر بە گریانی بگرێت و گوتی:

– نازانم چیت پێ بڵێم!

– بیری لێ مەکەوە و پێم بڵێ.

– ممم، چوومە مانچستەر تا هەفتەیەک لەوێ بمێنمەوە، ڕۆیشتم سەردانی دۆستێک بکەم لەوێ!

– ئێ!

– چووم سەردانی *ئیمیلی سەمعان* بکەم، تۆ نایناسی!

بە خرۆشانەوە سەرم لەقاند و گوتم:

– ئێ ئێ!

– بڕیار وا بوو سبەی بگەڕێمەوە، بەڵام حەزم کرد سوپرایزێک بۆ جیهاد بکەم و هەر لەبەر ئەوەش ئەمڕۆ گەڕامەوە.

هەستم کرد خەریکە تێدەگەم کە چی ڕووی داوە، پێم گوت:

– ئەی دواتر چی بوو؟

دایە پرمەی گریان و گوتی:

– گەڕامەوە و سەیر دەکەم ماڵەکە هەمووی مۆم و گوڵە هوزام! وام زانی بۆ منی هێناون! نازانم بۆ ئەوەم بە مێشکدا هات، چونکە جیهاد نەیدەزانی دەگەڕێمەوە، بەس نازانم بۆ وا بیرم کردەوە کە ڕەنگە بۆ منی هێنابن! ئای چ گێژۆکەیەک بووم!

توند بە سنگی خۆممەوە نووساند و بەدەم ڕشتنی فرمێسکەوە، گوتی:

– لە ژووری نووستنەکە گوێم لە دەنگیانەوە بوو، تۆ بەس بیری لێ بکەوە هوزام، لە ژوورەکەمدا، لەسەر سیسەمەکەم!

– ئارام بەرەوە، ئارام بەرەوە! دڵگران مەبە، هەموو کێشـــەیەک چارەیەکی هەیە، ئۆقرە بگرە.

– ئاخر شتی وا لە جیهاد دەوەشێتەوە هوزام، جیهاد!؟ شتی وای لێ چاوەڕوان دەکرا!؟ لە هەموو کەســێ دەکرا، بەس جیهاد!؟ ماقووڵە جیهاد! ؟

– باشە باشە هیچ مەڵێ! هەستە، بڕۆ خۆت بشۆ و منیش شتێ بۆ خواردن ئامادە دەکەم.

– تاقەتم نییە هوزام! ڕێک خەریکە دەمرم!

– گەر ئافرەت بەهۆی ناپاکیی مێردەکەیەوە بمردبا، ئەوا نیوەی ئافرەتانی جیهان دەمردن!

بەدەم فرمێسکسڕینەوە گوتی:

– دەتەوێ بڵێی کە نیوەی پیاوانی جیهان ناپاکیەرن؟!

– بگرە هەموویان، بەڵام تەنیا ناپاکیی نیوەیان لای هاوسەرەکانیان ئاشکرا دەبێ!

خەمگینانە خەندەی کرد و گوتی:

– ئای خودایە! من نازانم ئاوا شتەکان بە فشقیات وەرگرم؟!

– ژیان زۆر لەوە فشـقیاتترە کە بیری لێ دەکەیتەوە، ئەوە ئێمەین کە ئاڵۆزی دەکەین مادلین!

– تەڕ و وشـــک پێکەوە مەســـووتێنە، تۆ چووزانی! تۆ هەموو ڕۆژێکی خوا خاتوونێ لە ژیانتدا هەیە، یەکێ دێ و یەکێ دەڕوا. لە مانای پابەندبوون و پەیوەستبوون و عیشق تێناگەی!

هەستامەوە و بەرەو حەمامەکەم برد: «تا خۆت دەشۆی، دوو پارووی بەلەزەتت بۆ ئامادە دەکەم، لە دۆلابەکەی خوارەوەش خاولیی لێیە.»

ناچارانە چووە حەمام و منی لە مووبەقەکە جێ هێشت. خەم و قەهری ئەو عیشقە مەزنەی کە لەوەدا بوو کۆتایی بێت، سەراپای داگرتبووم. نەمدەتوانی کارەکەی جیهاد قبووڵ بکەم. ئەوە هیچ کە جیهاد هاوڕێی تەمەنمە و دەکرێت هەموو شتێکی لێ قبووڵ بکەم، بەڵام بەرگەی ئەوەم نەدەگرت مادلین ببینم کە ئازار دەچێژێت، هەموو شتێکی لێ قبووڵ دەکەم، بەس کە هاتە سەر مادلین، نا!

مادلین و جیهاد بۆ من تەنیا دوو هاوڕێ نەبوون، بەڵکە خێزانێک بوون لەم غەریبییەدا، وابەستەیی و تاکە پەناگەیەک کە دەگەڕامەوە بۆی. لە ماڵی ئەواندا، هەستم دەکرد لە ماڵی خۆمدام. ئاشنای یەک بە یەکی شتەکانیان بووم و جێگەکانیانم دەزانی. لای ئەوان هیچ هەستم بە نامۆیی نەدەکرد، بگرە وام دەزانی بەشێکم لێیان، وەک بڵێیت هەر دەبێت لەنێوانیاندا هەبم و ئەمە یەکلایی بووبێتەوە.

هەرگیز لە یادی ناکەم کە چەندان کچی پێ ناساندم تا هاوسەرگرییان لەگەڵدا بکەم. چۆن ئەو پاکەتە کێکانە لە بیر بکەم کە لە هەموو جەژنێکدا بۆی دەهێنام، یان سوپرایزەکانی یادی لەدایکبوون کە بۆی دەکردم و جگە لەو کەسی تر بیری نەبوو. چۆن ئەوەم بیر دەچێتەوە کە پێش چەندان ساڵ و کاتێک نەشتەرگەریی ڕیخۆڵەکوێرەم بۆ کرا، مادلین تاکە کەس بوو کە پاش بەئاگا هاتنم، چاوم پێی کەوت.

ئەو بەرماڵە لە یاد ناکەم کە بە دیاری بۆی هێنام تا نوێژی لەسەر بکەم! ئەو ڕۆژە بە گاڵتەوە لێم پرسی:

– خۆ تۆ مەسیحییت، چۆن بەرماڵێک بە دیاری دەدەیتە موسڵمانێک؟ شەرم ناکەی؟

گوتی:

– ئاواتەخوازم گەر یەک جاریش بێ لە ژیانمدا ببینم نوێژ دەکەی!

– جا بە تۆ چی؟

بە تووڕەییەوە گوتی:

– نامەوێ بچیتە دۆزەخ براکەم!

ئەو ڕۆژە زیاتر مادلین چووە دڵمەوە. عاشقی دڵسافی و لێبووردەیی و باوەڕی بووم. خوازیار بووم ڕۆژێک منیش وەک ئەوم لێ بێت. چیرۆکی عیشقی جیهاد و مادلین، چیرۆکێکە کە لە کاتی پەژارەدا هانای بۆ دەبەم. ئەم چیرۆکە وام لێ دەکات هەست بکەم عیشقێک، ئافرەتێک، هێشتا لە جێیەکی ئەم دنیایەدا بەشوێن مندا دەگەڕێت، ئیتر چۆن دەکرێت ئەم چیرۆکە ناشرین بکەن؟ بۆ وام لێ دەکەن؟!

مادلین لە حەمام هاتە دەر و خاولییەکی گەورەی لە خۆیەوە پێچابوو، چێشتم دەکردە قاپەکەیەوە و گوتم:

– چاک پێت لێ ڕاکێشاوە!

ئەو خاولییەی ڕێک کردەوە کە لە قژییەوە پێچابوو و گوتی:

– یانی چی!

– یانی خەریکە ناز دەکەی!

– تێنەگەیشتم.

– بە خاولییەکەوە بە ماڵی مندا دەسووڕێیتەوە؟

– ئەی هاوار، بۆ مەگەر تۆش بە شۆرتەوە بە ماڵی مندا نەدەسووڕایتەوە!

– ئەوە بەینێ بوو، ئێستاکە بەڕێزم، سەردەمەکە گۆڕاوە!

– ئێوە دایم وان؟ تۆزێ خلیجی، تۆزێ لوبنانی، کەمێ میسـری، کەمێ ئینگلیزی، تۆ چییت، ناسنامەت نییە؟!

– جەوازی سەفەرم هەیە!

کەمێک بێدەنگ بوو و جا بە حەسرەتەوە گوتی:

– ناتوانم بڕوا بەوە بکەم کە ڕووی دا.

چێشـــتەکەم بردە ســـەر ئەو مێزی نانخواردنەی کە لەسـەری دانیشتبوو و گوتم:

– بیری لێ مەکەرەوە، پیاوان سەگی بەرەڵان!

بە دڵتەنگییەوە پێکەنی:

– لەوەتەی هاتووم بەس ئەم قسەیەتم بەدڵ بووە.

– بڕوات هەبێ مادلین، چوار بژاردەت لە بەردەمدایە. یان ئەوەتا هەموو ئەو شـتانەی لەبیر بکەی ئەو شـەوە ڕوویان داوە و زۆر درەنگ نا بەیانی بگەڕێیتەوە لای جیهاد و لێی خۆش ببی وەک ئەوەی هیچ نەبووبێ، یان ئەوەتا بگەڕێیتەوە لای و ڕوون و ئاشکرا هەمووی پێ بڵێی و هەوڵ بدەن لەسەر شتێک ڕێک بکەون، یانیش بڕۆی هەموو شتێکی پێ بڵێیت و بۆ ئەبەد جێی بهێڵی.

– ئەی چوارەمیان چییە؟

– یان ئەوەتا لەگەڵ مندا ناپاکیی لێ بکەی و یەکسان ببنەوە!

لە دڵەوە پێکەنی، خەندەیەکم کرد و گوتم:

– مادلین، گەر پەیوەندییەکەیان ڕاسـتەقینە بووایە، جیهاد پێی دەگوتم. ئەم کچە تەنیا بۆ هەوەسێک بووە و بەس، چێژێک کە تەنانەت

لە ڕووی نایەت لای منیش باسی بکا. بڕوات هەبێ مادلین، ئەم جۆرە چێژانە زۆر زوو کۆتاییان دێ.

- هوزام گیان، ئەوەی جارێ هەڵەی کرد، ملیۆنێ جاری تریش دەیکاتەوە!

- مادلین، جیهاد تەمەنێکی هەیە، تۆش هێشتاکە منالی. هەر لەبەر ئەمەشە کە عەودالی چێژە، چونکە دەیەوێ بۆ خۆیی بسەلمێنێ کە هێشتا پێی ماوە و گەنجە!

- ٤٦ سالم هوزام، تۆش دەلێی هێشتا منالی!

- ئێ ئەو شەست و شتێ سالە، هەرچەند تەمەنێکیشت هەبێ، بەلام لای جیهاد هەر منالی.

کەمێ بێدەنگ بوو، جا هاوکاتی بردنی کەوچکەکەوە بۆ دەمی، گوتی:

- وتت خلیجییەکان بۆچی لەگەل لوبنانییەکاندا بە لوبنانی قسە دەکەن؟

- فرەبەهرەیی!

مادلین پێکەنی و تۆزێک ئاسوودە بووم! هەر بەو جۆرەی کە قسەی لەسەر کرابوو، بۆ ڕۆژی دواتر گەڕایەوە لای.

گەڕایەوە لای جیهاد وەک ئەوەی هیچ نەبووبێت، هەرچەند بڕیاری دابوو کە وانەیەکی باشی دابدات. دەمزانی مادلین قەت بیر لەوە ناکاتەوە ناپاکیی لێ بکات، بەو جۆرەی کە زۆربەی ئەو ئافرەتانەی ناپاکییان لێ دەکرێت و لە کۆمەلگەیەکی ئازاددا دەژین، ناپاکی لە مێردەکانیان دەکەنەوە. وێڕای هەندێک وردەگوناح، باوەڕدار بوو و لە مەسیحییە پارێزکارەکان بوو، ئەوانەی کە هەرگیز لە وەها گوناحێ نزیک ناکەونەوە.

ئێستەش ڕوخساری جیهادم لە پێشچاوە کە ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر دەترشا، بەڵام نەمدەوێرا لە هۆکاری گۆڕان و ئەو پەژارەیە بپرسم کە بە زەقی دیار بوو وردە وردە بەرۆکی دەگرێت. لێم نەپرسی، چون هەرچەند پەیوەندییەکەشمان پتەو بێت، بۆ وەها گفتوگۆیەک دەبوو ئەو دەست پێ بکات نەک من.

بێدەنگییەکەی درێژەی نەکێشا، لە کتێبخانەکەم بووم کاتێک پەیوەندیی پێوە کردم، یەکسەری گوتی: «دەمەوێ بتبینم!»

کە هات، پیاوێکی لەڕێ خەمۆکم بینی و دەتگوت دواهەمین مرۆڤە! پێی گوتم:

– دەبێ ئەم قسانە بەس لە بەینی خۆماندا بمێننەوە.

– پێویست ناکا داوای وەها شتێکم لێ بکەی، چونکە هەمیشە قسەکانمان لەنێو خۆماندا ماونەتەوە.

– بەڵام ئەم جارەیان جیاوازە هوزام، ئەم بابەتە وەک هیچ شتێکی تر نییە!

بە لاقرتێیەوە پێم گوت:

– مۆساد ئیشی پێتە؟

– ئەم بابەتە بۆ من لە هەموو ئەو شتانەی بیریان لێ دەکەیتەوە گرنگتر و گەورەترە.

منیش جددیانە گوتم:

– بێخەم بە و قسە بکە!

– مادلین، مادلین هوزام!

– مادلین چییەتی؟

دوودڵانە پەنجەی بە ڕوومەتیدا دەهێنا:

– نازانم!

– چیت له دڵدایه بیڵێ.

– هەست دەکەم مادلین وەک جاران نەماوە، شتێکییەتی!

– شتی وەک چی؟

– نازانم! نازانم.

– دەی بیڵێ.

– هەست دەکەم ناپاکیم لێ دەکا.

بە گاڵتەوە پێم گوت:

– ئەوە چی دەڵێی!

بە تووڕەییەوە گوتی:

– هەر دەمزانی گاڵتەت بە قسەکەم دێ.

– تۆ بووەستە، من بەس سەرم سووڕ ماوە، هەموومان دەزانین کە مادلین چەندە تۆی خۆش دەوێ، ئیتر نازانم ئەم بیرکردنەوەیەت لە کوێ هێناوە؟

– هەڵسوکەوتەکانی هوزام! هەڵسوکەوتەکانی. ئەوە ژنەکەی من نییە! زۆر گرنگی بە خۆی دەدا، زۆر دەگەڕێ، زۆر دەر دەکەوێ، خۆ ڕاستە مادلین حەزی لەم شتانەیە، بەس بەو ڕادەیەش نا.

پێم گوت:

– جا خۆ ئەمە بەڵگە نییە کە ناپاکیی کردووە.

– بڕوا بکە هوزام، گەر دڵنیا ببمەوە، بڕوا بکە دەیکوژم!

پێم گوت:

– وەللا بابە ئافەرم! دەیکوژی چونکە گومان دەکەی ناپاکیت لێ دەکا، بەس خۆت ناکوژی لە کاتێکدا ناپاکیی لێ دەکەی.

بە ئاسانەوە گوتی:

– ناپاکیی چی و شتی چی! ئەم قسەیەت لە کوێ هێنا؟

ئانیشکم لەسەر مێزەکەی دادا و بەرەو ئەو چەمامەوە:

– پێش مانگێک، کە مادلین لە مانچستەر بوو.

بەرزەپا راست بووەوە و گوتی:

– تۆ چۆنت زانی؟

– ئەو پێی گوتم.

– مادلین؟!

– دەیویست سوپرایزت بۆ بکا، بەس کە دێتەوە مال، سەیر دەکا تۆ سوپرایزێکی زۆر گەورەترت بۆ کردووە.

– شتی وا نەڵێی!

بێئاگایانە گوتم:

– هات بۆ مالم و کەم تا زۆر تێک شـــکابوو، بەس خەمت نەبێ لاوازی و ئازارەکانیم نەقوستەوە، چۆن هات، ئەوهاش بە سەلامەت رۆیشتەوە!

دەستی بە سەرییەوە گرت و گوتی:

– مالت کاول بێ هوزام، ئەمە چ هەوالێ بوو!

– تۆ هەلە دەکەی و دەبێ مالی من کاول بێ!

– ئەی خوا هاوار!

- قەت بیرم لەوە نەدەکردەوە ناپاکی لە مادلین بکەی.

- توو خوا وا مەڵی، خۆت هەر ڕۆژەو لەگەڵ کچۆلەیەکدای، ئێستە هاتووی لۆمەی من دەکەی.

- جا خۆت بە من بەراورد دەکەی، من هاوســەرم نییە! بە ژیانم خاتوونێکی وەک ئەوەی تۆم نەبووە!

- خوا خێر نەهێنیتە ڕێت هوزام، خوا چی و چیت لێ بکا! ئەی بۆ ئەو هەموو کاتە بێدەنگ بووی؟

- مادلین داوای لێ کردم پێت نەڵێم، ئێ هەقی خۆشــییەتی کە داواکەی بەجێ بگەیەنم.

- یانی ئەوەی بیری لێ دەکەمەوە وەهم نییە! مادلین ناپاکیم لێ دەکا.

- مادلین شتی وا ناکا.

- ئەی گەر شــتێ لە ئارادا نییە، بۆ ئەو هەموو کاتە بێدەنگ بووە؟ هیچ ئافرەتێ نییە ببینێ هاوســەرەکەی ناپاکیی لێ دەکا و بێدەنگ بێ. مادلین قبووڵی ناکا، چۆن بێدەنگ دەبێ گەر شتێ لە گۆڕێدا نەبێ!

- مــادلین لە من و تۆش زیرەکترە، توانیی ئەم هەموو کــاتە شکەنجەت بدا، بێ ئەوەی دڵسۆزیی خۆی لەکەدار بکا.

- چی بکەم هوزام؟ توو خوا لەگەڵم بە...

- ســەرەتا پێم بڵێ، ئەم کچە کێ بوو لەگەڵی بووی و چەنێکە پێکەوەن؟

- بە گیانی تۆ و مادلین، لە ماوەی بیســت ســاڵی ڕابردوودا، ئەمە یەکەم جارمە شتی وا بکەم.

- پێم ناڵێی کێ بوو؟

– کچێکە نایناسی، لە فرۆکەدا ناسیم، کاتێ لە دواهەمین کۆنگرەی بەیرووت دەگەڕامەوە. جگە لە حەزێک هیچی تر نەبوو هوزام. بڕوا بکە هەر زوو پەنجەی پەشیمانیم گەست.

– چییە تا تێت نەگیری نایەی!

– چی بکەم هوزام؟ پێم بڵێ چی بکەم؟

– بە ڕای من پشـوویەک بدەن، پێکەوە قسـە بکەن و هەوڵ بدەن ئەوە تێپەڕێنن کە ڕووی دا، بۆ نموونە بیبەرە *مالدیف*، یان *بالی*. بچنە جێیەک کە بتوانن عیشقی خۆتانی تێدا تازە بکەنەوە.

جیهاد کەمێ خەیاڵی ڕۆشت و دواتر گوتی:

– خوا خێرت نەنووسـێ! خوا خێرت نەنووسـێ! خۆ من تۆم بە دۆستی خۆم دەزانی، چۆن ئەم هەموو ماوەیە بێدەنگ بووی؟

– منیش تۆم بە دۆستی خۆم دەزانی و پێم وا بوو هەموو شتم لا باس دەکەی، بەس دەر کەوت کچومچ و نهێنیی خۆتت هەیە. بەخێر نەیەیتەوە!

– توو خوا وازم لێ بێنە، دەمەوێ کەمێ تەنیا دانیشم.

هەسـتامەوە و بەرەو دەرگەی کتێبخانەکە کەوتمە ڕێ، لەپڕ بە تووڕەییەوە هاواری کرد:

– نازانم بۆ بە لوبنانی قسەم لەگەڵ دەکەی!

لێوبەخەندە ئاوڕێکم بۆ دایەوە و گوتم: «فرەبەهرەییە ئیتر!»

جا بەدەم پێکەنینەوە چوومە دەر!

لەبەر ئەوە پێکەنیم کە جیهاد و مادلین زۆر لە یەک دەچن، تەنانەت تا زیاتر بچنە تەمەنەوە، سـیماشـیان لە یەک نزیکتر دەبێتەوە، وەک

بەو ئاسوودەییە گەیشتمەوە کە هەر لەو شەوەوەی مادلین دڵشکاو
پێی نابووە بەر دەرگەکەم، لە دەستم دابوو. بەردەوام و جار دوای
جار بیرم دەکردەوە کە چۆنچۆنی دوای ئەم ناپاکی و کوڵانەی
ناپاکی، عیشق پێش ئەوەی دواهەمین هەناسەی خۆی هەڵکێشێت و
سەر بنێتەوە، بەردەوامی بە خۆی دەدات!

●●●

هەرچەند من بوونەوەرێکم باوەڕم بە چارەنووس هەیە، بەڵام
هەرگیز لەگەڵ مەرگدا ناسازێم.

زۆر بیر لەوە دەکەمەوە کە «مەرگ کۆتایی چیرۆکەکە نییە، بەڵک
سەرەتایەتی». ئەمە ئەو ڕستەیەی موستەفا مەحموودە کە زیاد لە ..
ساڵە لە کتێبخانەکەمدا هەڵم واسیوە و هێشتاش نازانم چ مانایەک لە
پشتییەوە خۆی حەشار داوە و، زیاتر لەبارەی دوای مەرگەوە
دڕدۆنگی کردم.

لە ڕووناکی و تاریکیی دوای مەرگ ڕادەمێنم، بیر لە ڕێگە و
بەرزەخەکەی دەکەمەوە، لە بۆنەکەی، ڕەنگەکەی، لە گرنگیب
تەمومژاوییەکەی، لە ترسی شاراوەی.

من هەمیشە سەوداسەری بەهای مەرگ بووم، لە هەموو ئایینەکانا
لەدوی گەڕام، وەلی نەگەیشتمە بۆچوونێکی ڕوون لەبارەی ئەم
ئەزموونەوە. هەموو بیروڕاکان تا ڕادەیەکی زۆر مەودای بیرکردنەوەی
منیان تێپەڕاندووە. هەرچەند بڕوام وایە کە ئەو بیروڕایانەی لە
ئیمانەوە سەرچاوە دەگرن ئەقڵ نایانگرێت، بەڵام هەر بەو جۆرەش کە
هەندێک فەیلەسووف بڕوایان پێیەتی، زۆر لەگەڵیدا ناکۆک نیم. کەچی
سەرباری ئەوەش، بەشوێن وەڵامێکدا وێڵم کە کونجکۆڵیم لەبارەی
مەرگەوە کە بێئاگاییم لێی شەکەتی کردووم، بڕەوێنێتەوە.

ئەو ڕستە سادەیەی جیهادم بیرە کە ڕۆژێکیان بەدەم مشتومڕکردنی ئەم پرسەوە، بێزارانە پێی گوتم: «زۆر بیری لێ مەکەرەوە هوزام، کە مردی، هەموو وەڵامەکانت دەست دەکەون.»

هەرچەند قسەکەی جیهاد تا سەرئێسقان واقعی بوو، بەس زۆریش دڵتەنگی کردم. بەوە دڵتەنگ بووم کە بۆ ئەوەی وەڵامەکان بزانم، دەبوو خۆم بە ئەزموونەکەدا تێبپەڕم. ئاخر من لەو مرۆڤانەم کە زۆر پشت بە تیۆرییەکان نابەستم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆم نادەمە بەر شەپۆلی «هەموو» ئەزموونێک تا تیۆرییەکی دیاریکراو پشتڕاست بکەمەوە، بە تایبەت گەر بابەتەکە پەیوەندیی بە شتێکی شاراوەی وەک مەرگەوە هەبێت. مەرگ وەک ژیان نییە، ئەزموونی مەرگ فریومان نادات، بە هیچ جۆرێک فریومان نادات!

مەرگ لە هەموو شتێک بەسامترە، سامەکەشی لەوەدایە کە قوربانییەکانی دەنگیان نییە. چونکە کە یەکێک دەمرێت، ئیدی بۆ ئەبەد دەنگی نابیسترێتەوە. ئەوەی مرد ناگەڕێتەوە، مەرگ هیچ هێڵێکی گەڕانەوەی نییە، هێڵێکی ڕۆیشتنی بێگەڕانەوەیە، ڕێگەیەکی یەکئاراستە، پێشوازی لە مرۆڤەکان دەکات و نایانێرێتەوە، دەیانبات و نایانگەڕێنێتەوە. ئیدی چۆن لە مانای مەرگ و نهێنییەکەی تێبگەین، لە کاتێکدا ئەو ڕێگانەی بەرەو ئەوێ درێژ دەبنەوە، ڕێگەی گەڕانەوە نین؟

من پیاوێکم لە مەرگ ناترسم، بەڵام ڕێزی دەگرم، لە هەموو شتێک زیاتر ڕێزی دەگرم. ڕێز لە سام و ناڕوونییەکەی دەگرم، شکۆدارییەکەی کە هیچ شتێک شان لە شانی نادات! هاتنەکەی شکۆدارە، داخەکەی، ڕەشێتی و بێدەنگی و ساردوسڕییەکەی، هەموو شتێکی مەرگ شکۆدارە.

هەر بۆیەش هەمیشە سەری ڕێزم بۆ مەرگ نەوی کردووە، چونکە پێویست ناکات ئەزموونی ئەو شتە بکەم کە ڤۆڵتێر کردی، ئەو ڤۆڵتێرەی وەک دەڵێن سەرسەختترین بێباوەڕ بووە و لە دوابەدواکانی

ئەمەشیاندا قێزەفرەتەی لە مەرگ کردووە، بەڵام لە کۆتایی ڕووبەڕووبوونەوەمیدا مەرگی بە دزێوی و ترسناکییەکەی کردووە بۆ بێ ئەوەی ئەزموونیشی بکەم، زۆری دەگرم، بەم ڕێزگرتنەم ڕازیم و دەزانم کە هەر ڕۆژێک دەگەمە خزمەتی، بەڵام شانەوێند بە ئازارەوەوە بمرم و، دووریی ئەویش بێئەندازە ئازارم دەدا. دەرویش دەڵێت: هۆکارەکانی مردن زۆرن، لەنێویاندا ئازاری زیانە. منیش مرۆڤێکم بڕوام بە وشە بە وشەی قسەکانی دەرویشە، هەر زۆریش بڕوام پێیانە.

***

دوێنێ

پێشەچوو گشت گرفتەکانم زۆر لێمەوە دوور بن

بەڵام ئێستە، هەست دەکەم لێرەن و نیازی ڕۆیشتنیان نییە

وای، من بڕوام بە دوێنێیە!

کتوپڕ

سەیر دەکەم چیتر نیوەپیاوەکەی جاران نیم

سێبەرێک بە بان سەرمەوەیە

وای وای، دوێنێ لەپڕ هات

ئەو دەمەی گۆرانییەکان دەمانگرێنن، یان لەوپەڕی تێش و ئازاردایین، یان ئەوەتا لە هەموو کات زیاتر پێویستمان بە کەسێ هەردوو هەستەکەش یەک لە یەک تاڵترن!

ئای خودایە، چەند سەختە پیاوێک کە لە ناوەڕاستی چلەکانی تەمەنیدایە، گۆرانییەک بیگرێنێت کە تەمەنی هەر دە ساڵێکە! بەڵام

گۆرانیی «دوێنێ»ی بیتڵز دەمدوێنێ، باسی حاڵی من لە کاتی ئامادەیی و دوورکەوتنەوەی ئەودا دەکات. ئەم گۆرانییەی بیتڵز، گەنجینەی مرۆڤایەتییە و تا ئەو کاتەی مرۆڤ لەسەر ئەم زەوییە قر دەبێت، دەمێنێتەوە. وای خودایە، هەست دەکەم بێ ئەو هیچ نیم. ئەم هەستانەش نائەقلانین، ئەم هەستانە هەرگیز لەگەڵ لۆژیکدا یەک ناگرنەوە، بەڵام خۆ عیشقیش باروودۆخێکی نالۆژیکییە و گومانی تیدا نییە کە دڵنەواییەکی تێدایە بۆ من.

کێ بڕوا دەکات پیاوێکی وەک من، هێندەی من، شەوەکانی لەسەر قەنەفەیەک بەسەر ببات کە بۆنی ئافرەتێکی لێوە دێت کە تەنانەت ناوەکەشی نازانێت. ئەو قەنەفەیەی کە لەوەتەی ئەو لەسەری هەستاوە، لەوەتەی بۆن و سووراوی سووری ئەوی گرتووە، بووەتە تەختی من.

ئەوە کێ بوو وتی عیشق ژیانمان پێ دەبەخشێت؟ ئەسڵەن عیشق سەقامگیریمان دەشێوێنێ، دەمانگۆڕێ، زۆر زۆر دەمانگۆڕێ. پێویست دەکات بە تەواوی لە ژیانم بیسڕمەوە، فڕێی بدەمە دەرەوەی مێژوومەوە و ئەو بەشەی یادگەم لە دەست بدەم کە پەیوەستە بەوەوە. وەلێ وەک ڕۆژی ڕۆشن دەزانم کە توانای وەها کارێکم نییە.

ئەم ئافرەتە کە هات، زانیی لە ناخمدا هێلانە دەکات. هات و دڵنیا بوو لەوەی کە پێشتر ئافرەتێکی وەک ئەو لە ژیانمدا نەبووە، هەر لەبەر ئەم هۆکارەش بوو کە هاتنەکەی بەگوڕ، تووش و پڕ هەراوزەنا بوو.

من مرۆڤێکم، کە تەنیا و تەنیا زیرەکەکان دەوروخولی دەدەن. زیرەکیی ئافرەتیش لەوەدا نییە وا لە پیاوێک بکات خۆشی بوێت، یان لەبیرکرانی بکاتە کارێکی سەخت، بەڵکە زیرەکییەکەی لەوەدایە کە لەبیرکرانی بکاتە نەکردە. خۆشەویستەکەی منیش، ئافرەتێکی بێئەندازە

زیرەکە، ئافرەتێکە کە وەختێک بە ژیاندا ڕاگوزەر دەبێت، نە دەتوانێت پشتگوێی بخەیت، نە تێشی پەڕێنیت.

سەختترین لایەنی عیشق ئەوەیە خووەکانت بە کەسی بەرانبەرەوە بەسترابنەوە، چونکە کاتێک لێی جیا دەبینەوە، ئیدی ئەم خووانە دەبنە خورەی گیانمان. بەزۆری وردەکارییەکان تەنگمان پێ هەڵدەچنن، هەر وردەکارییەکانیشن کە دەمانناسێنن و، منیش پیاوێکم کە وردەکارییە زۆر بچووکەکانم خۆش دەوێن و عاشقیانم.

لە چێشتخانەیەکدا، بە خۆشەویستییەکی لێوڕێژ لە بێدەنگییەوە نیگای یەکمان دەکرد. ئانیشکم دادابوو و بە دۆشدامانەوە لێم دەڕوانی، ئەویش وەک من دانیشتبوو و بێدەنگ ئانیشکی دادابوو، وەک ئەوەی عیشق زمانی لە گۆ خستبێن. ئەو ڕۆژە سەرنجم دا بە پێچەوانەی «زۆربەی هەرە زۆری» مرۆڤەکانەوە، کاتژمێرەکەی کردووەتە دەستی ڕاستی. لێم پرسی:

– بۆچی کاتژمێرەکە لە دەستی ڕاستتدایە؟

خەندەیەکی کرد و گوتی:

– ئەی کاتژمێرەکەی تۆ بۆچی چارەکێک لە پێشەوەیە؟

دامە قاقای پێکەنین، ئاخر کەس ڕۆژێک لە ڕۆژان سەرنجی نەدابوو کە من چارەکێک سەعاتەکەم پێش دەخەم!

وەڵامم دایەوە:

– نازانم! هەست دەکەم خووە! ڕەنگە من لە پێش بم، یاخود کەلکەی داهاتووم بێ، ئەی تۆ؟

وەڵامی دایەوە:

– منیش نازانم! ڕەنگە هەر ئەوە بێ کە پێچەوانەی مرۆڤەکانی ترم.

ئەو رۆژە کاتژمێرەکەم دانا و وەک ئەو کردمە دەستی ڕاستمەوە، ئەویش کاتژمێرەکەی خۆیی وەک هی من چارەکێک پێش خست، تا لە پێش هاوڵاتیانی لەندەنەوە بین و کاتێکی تایبەت بە خۆمانمان هەبێت.

بەڵام هەنووکە ئەم کاتە تایبەتەمان ئازارم دەدات، چون هەموو جارێ کە سەیری کاتژمێرەکەم دەکەم، بیر لەو کاتە دەکەمەوە کە دەگەڕێتەوە لام! بیر لە هۆکارەکانی دواکەوتنی دەکەمەوە و بە هیچ ئەنجامێک ناگەم. گۆرانییەکەی بیتلزیش ترس و برسییەتی و ئاسە، زیاتر و زیاتر لە ناخمدا دەورووژێنێت.

ئازانم

بۆ دەبوو ئەو بڕوا! پێی نەگوتم

کێشەیەک هەیە و ئەمێستاکە مەیلی دوێنێ دەکەم

دوێنێ

عیشق یارییەکی ئاسان بوو

بەڵام ئەمڕۆ، پێویستم بە جێیەکە خۆمی تێدا بشارمەوە

وای، چەندە باوەڕم بە دوێنێیە!

هەر بە جددی تێناگەم کە بۆچی دەڕوا و ئەویش قەت هۆکارەکانی ڕۆیشتنیم پێ ناڵێت. هەموو کات عیشقم لا یارییەکی ئاسان بووە، وەلێ ئێستە پێویست دەکات لە دوورەوە خۆم بشارمەوە، زۆر دوور، لەبەر ئەوەی دەر کەوت عیشق لە من گەورەترە، چیتر ئەو یارییە ئاسانە نییە کە بیرم لێ دەکردەوە! نازانم هۆکارەکەی تەمەنمە، یان باڵادەستیی خۆشەویستەکەم.

شەوی سەری ساڵی ڕابردوو، میوانی جیهاد و مادلین بووم کە لە زۆربەی بۆنەکاندا بانگهێشتم دەکەن. هەستامەوە تا شتێک بۆ ئەوان و دەستەیەکی بچووکی دۆستان کە لەوێ بەشدار بوون، بخوێنمەوە. لیستەی ئەو شتانەم خوێندەوە کە لە ساڵی تازەدا دەبوو بیانکەم. ئەی دواهەمین سرووتی ئەو ساڵەم بوو. بیرمە دوای ئەوەی لیستی تایبەتەکەی خۆمم خوێندەوە، مادلین بە گاڵتەوە پێی گوتم: ئەی خۆشەویستی کوا هوزام؟ پێویستت بە خۆشەویستی نییە؟!

ئەو شەوە وەڵامم دایەوە و گوتم کە خۆشەویستی لە بەرنامەی مندا نییە، چونکە خۆشەویستی بێ هیچ ئاگادارکردنەوە و بەرنامەیەک خۆی بە دەلاقەی دڵتدا دەکا! وا بزانم بە هەڵەدا نەچووبووم، چونکە کتوپڕ عاشق بووم، بێ هیچ پلانڕێژی و مۆڵەتێک بووە میوانم. لە شەوێکدا تووشی دڵدارەکەم هاتم کە هەرگیز پێشبینیم نەدەکرد تێیدا عاشق ببم. پاش دوو مانگ لە خوێندنەوەی ئەم وتارە «پڕوپووچەم» هاتە ژیانمەوە. لە مانگی شوباتی پارساڵدا چاومان بە یەک کەوت، ڤالانتاین و کیوبید[1] و باران و ڕەنگی سوور پێکڕا بەسەرمدا بارین. ئیدی نە بەرگەی ئەم شتانەم گرت و، نە ئەویش. ئاقیبەت لە مانگی عاشقاندا، عاشق بووم.

وای خودایە، هەندێ کات عیشق چەندە ئازاربەخشە. ئازار جگە لە ڕووێک لە ڕووەکانی عیشق هیچی تر نییە. هەرچەند هەمیشە باوەڕم وا بووە کە ئەوە ئازارە بەرەو داهێنان و گەورەبوون پاڵمان پێوە دەنێت و دەمانکاتە مرۆڤگەلی مەزن، بەڵام گەیشتوومەتە ئەو بڕوایەی کە قۆناغێک هەیە هەر کە پێمان خستە ناوی، ئیتر دەستەپاچە دەبین.

---

1. Cubid: کیوبید کوڕی «ئەفرۆدایت-ڤینۆس»ی خانمەخوداوەندە و خوێشی خوداوەندی عیشقە لە ئەفسانەی ڕۆمانیدا. «و. ک»

ئۆسکار وایەلد[1] دەڵێت کە ئازار دووهێندەی چێژ کارمان تێ دەکات. پێم وایە چاکی پێکاوە.

بیرمە ڕۆژێکیان لێم پرسی:

- ئەو خۆشەویستییەی نێوانمان گەمژەییە یان نا؟

زۆر بە سادەیی وەڵامی دامەوە:

- جا گەر واش بێ چییە!

- یانی کاری گەمژانە دەکەی و هەست بە تاوانیش ناکەی بەرانبەر خۆت؟!

- من کاری گەمژانە ناکەم، کاری گەمژانە من دەکا!

هەر ئەو ڕۆژە بە تەواوی لام ڕوون بووەوە کە ئەم ئافرەتە زۆر لەوە زیاتر بڕوای بە خۆیەتی کە من بیری لێ دەکەمەوە. هەر ئەوکات بۆم دەر کەوت کە ئەمە ئافرەتێکە پەنجەی پەشیمانی ناگەزێت و ئاور بۆ ئەو شتە ناداتەوە کە جێی دەهێڵێت. ئافرەتێکە پێی وایە کە تاوان بەرۆکمان دەگرێت، نەک ئەوەی ئێمە بە پیرییەوە بچین. هەر لەو ڕۆژەشدا بوو کە بڕوام بە فەلسەفەکەی ئەو هێنا لەبارەی هەڵە و کاری گەمژانە و تاوانەوە! بە دڵ و بە گیان باوەڕم پێی هێنا.

***

هەمیشە لە شانۆگەرییەکانی ویست ئێنددا، هەستم بە شتێکی ئەودونیا دەکرد. شتێک لە ئارامی و پێشکەوتن، شتێک لە سەرکەوتن و سۆز و ئازادی! دڵدارەکەشم لە عاشقانی شانۆگەرییەکانی لەندەن

---

[1] oscar wilde (١٨٥٤-١٩٠٠): نووسەر، شانۆنامەنووس، ڕۆماننووسێکی ئینگلیزی-ئیرلەندییە. لە ساڵانی حەفتادا ئۆسکار وایەلدا یەکێک بووە لە دیارترین ناوەکانی کایەی شانۆ، بەڵام لە ئێستەدا زیاتر بە وتەکانی بەناوبانگە. ڕۆمانی «دواهەمین وێنەی دۆریان گرەی» تاکە ڕۆمانی ئەم نووسەرەیە و بێ گومان لە باشترین ڕۆمانەکانی جیهانیشە. «و.ک»

بوو. شەویکیان بانگهێشتی یەکێک لە دڵخوازترین شانۆگەرییەکانی خۆمم کرد، شانۆگەرییەک کە زۆرترین کاریگەریشی لەسەر دانابوم. ئەو شەوە چووین تەماشای شانۆگەریی بینەوایانی ڤیکتۆر هۆگۆ بکەین. هەرچەند لە ماوەی ئەو دوو دەیەیەدا چەندان جار سەیری ئەم شانۆگەرییەم کردبووەوە، بەڵام ئەو شەوە جیاواز بوو. نمایشی ئەو شەوە لە هی هیچ کاتێکی تر نەدەچوو و کەموێنە بوو!

بیرمە کاتێک دەنگێکی بەسام گۆرانیی «خەونێکم دی»ی کرد، توند قۆڵی گرتم، جا کە گەیشتە ئەو برگەیەی کە دەڵێت:

*گەنج و چاونەترس بووم*

*خەونەکان چرۆیان کرد، گەشانەوە و سیس بوون*

بۆ یەکەم جار هەستم بە فرمێسکەکانی کرد کە دەتکانە سەر شانم. گریانەکەی بەجۆش، بڵند، شکۆدار و بەسام بوو. لەو ساتەدا بۆم دەرکەوت کە ئارامترین ساتەوەختی پیاو، ئەو ساتەیە کە باسکەکانی بە دەوری دڵدارەکەیدا دەئەڵقێنێت، ئەو دەمەی دڵدارەکەی ئاگر بەر دەداتە سینەی. پیاو کاتێ «مەعشووق»ـەکەی خۆی لە باوەش دەگرێت، هەست دەکات ژیان بە ئەوینەوە باوەشی بەمدا کردووە.

قەت نەمدەزانی وەها هەستێک بوونی هەبێت کە بۆ پیاو لە سەرووی چێژیشەوە بێت. هەستێک کە کەسەکە تێیدا چێژیش تێدەپەڕێنێ و دەگاتە قۆناغێکی ڕۆحیی ئارام و سەقامگیر. تەنیا ئەو وای کرد ئەزموونی ئەم هەستانە بکەم و وەک چۆن هەر ئەویش بوو کە منی بەم مەودا بەرفراوانەی ئەزموونکردن گەیاند.

لە ئەندامانی خێزانەکەم دابڕام و هیچ هەستم بە تاوان نەکرد، چونکە هیچیان تێدا نەچاندم. ئەوانەش کە سەرجێییان لەگەڵ دەکەم، لەگەڵ ڕۆیشتنیان فەرامۆش دەکرێن. دەڕۆن، بێ ئەوەی هیچ شتێک لە ناخمدا جێ بهێڵن. بەڵام ئەو، هەموو جار کە تەختەخەوەکەم جێ

دەمهێڵێت، ئانویەک بەسەر جەستەمەوە دەنەخشێنێت کە هەرگیز لێ نابێتەوە. هەموو جار کە ئۆغر دەکات، شتێک لە ئەو، تێمدا دەمێنێتەوە. شتێک کە هاوشێوەی نییە و سەر لەوەش دەرناکەم کە چۆن وام لێ دەکات.

دواهەمین جار کە ڕۆیشت، دەرکم بەوە کرد کە هێشتاش شتێکی سەردەمی لاوێتیم ئازارم دەدات، وەک گرێیەک ماوەتەوە و خۆی بە سووچێکی چیرۆکی ژیانمدا هەڵواسیوە. ئەم شتە نایەوێ هەڵبفڕێت، بە با بچێت و خۆی لە من دوور بخاتەوە.

لەو کاتەدا زانیم کە لە ژیاندا هەموو هەوڵێکم بۆ خۆشبەختی دا، زانیم کە گەر ئەم ئافرەتە بێگانەیە کتوپڕ بڕوا، ئەوا چیتر وەک مرۆڤێکی کامل نامێنمەوە. ئێستە دەزانم کە گەر جێم بهێڵێت، ئیدی هیچ شتێک بوونی نابێت کە من بە ژیانەوە ببەستێتەوە. کەچی لەگەل ئەوەشدا داوای مانەوەی لێ ناکەم. من پیاوێکم بەبێ داواکاری، هەموو ئەو شتانە قبوول دەکەم کە دێنە ڕێم. داواکاری و پرسیارێکم نییە و لە چارەنووس ناپاڕێمەوە، هەرگیزیش ڕۆژێ لە ڕۆژان لێی ناپاڕێمەوە تا داوای خۆشەویستی و سامان و شکۆی لێ بکەم.

چارەنووس وا بوو کە وابەستەییم بۆ شتێک هەبێت یان نا، هەر بە خاکەساری ژیانم بگوزەرێنم. هەر وا بەو گرێیەی ناخمەوە ژیان بەڕێ بکەم و لێوڕێژ لە گریش، سەر بنێمەوە. هەر بەو جۆرە بەڕێی دەکەم کە خانمەشاعیرێکی فەلەستینی ئاماژەی پێ دەدا: «نە ئامانجێکم پێکا، نە بە مەبەستێک گەیشتم، کۆتایی تەمەن هەر وەک سەرەتاکەی بەتاڵە» ئەمە چارەنووسی منە.

لە جەژنی سوپاسگوزاریی پارساڵدا چاوم بە یەکێک لە کەسایەتییە هەرە بەناوبانگەکانی کۆمەڵگەی جوانی بەریتانی کەوت و لەوی سیوانی یەکێک لە باشترین ڕۆژنامەنووسە لوبنانییەکان بووین کە میواندارییەکی «سوپاسگوزاری»ی گەورە ـ کە لەگەل شکۆی بونە و

میوانەکانیدا دەهاتەوە- ســـاز دابوو. پاش وتوویژێکی دووردرێژ سەبارەت بە ئاشتی، ئیسرائیل، فەلەستین و نەخشــەی ڕێگای «میواتیک» لێی پرســیم کە داخۆ منیش وەک ئـافەتکـارە داهێنەرەکەمان لوبنانم یان نا.

سەرپێییانە پێم گوت:

– نەخێر، لوبنانی نیم!

– ئەی خەڵکی کوێی؟

– زەوی هەمووی نیشـــتیمانی منە، مرۆڤایەتیش خێزانم. هەر بەو جۆرەی کە ڤۆڵتێر بڕوای پێی هەبوو.

خەندەیەکی کرد و گوتی:

– یانی نیشتیمانی خۆتت خۆش ناوێ؟

بە کورتی وەڵامم دایەوە:

– ڕەنگە خۆشم بوێ!

– دەزانی شکسپیر ئەوەی لا بووبووە پرسیار کە دەکرێ مرۆڤ بگاتە ئاستێک لە ناشـــرینی کە نیشـــتیمانەکەی خۆیی خۆش نەوێ؟ ڕەنگە گەر شکسپیر زیندوو با، ئەم پرسیارەی ئاراستە بکردبای.

بە گاڵتەوە پێم گوت:

– گەر شکسپیر لە ژیاندا بووایە، بێ ئەوەی پرسیارەکەیم ئاراستە بکا، لە هۆکارەکانی ئەم ناشیرینییەم تێبگەیشتبا!

پێکەنی و گوتی:

– کەوایە تۆ نیشتیمانپەروەر نیت! ئەی بێدینیشی؟

- نازانم گەر بە بیدینم بزانی یان نا، بەڵام خۆ بڕوام بە خودا هەیە و بە دڵنیاییەوە بێباوەڕ نیم.

- چۆنچۆنی بڕوات بە خودا هەیە گەر شوێن یەکێ لە ئایینەکانی نەکەوتبی؟

- موســـتەفا مەحموود کە لە بەناوبانگترین بیرمەندەکانی عەرەب بوو، دەڵێ ئێمە لە ڕێی *ویژدانمانەوە* بە *خودا شاد دەبین نەک ئەقڵمان*، منیش ویژدانم وام لێ دەکا هەر بە ڕاستی هەست بە خودا بکەم.

- بەڵام تۆ شــوێن هیچ ئایینێکی ئەو خوایە نەکەوتووی کە بڕوات پێیەتی، ئیتر چۆن دەکرێ خواپەرست بی؟

- مرۆڤدۆســـــتی کۆکراوەی هەموو ئایینەکانە ئەزیزم، هەر لەبەر ئەوەشە بڕوام پێیەتی.

لەو کاتەدا شـازادەی لەندەن خەندەیەکی پەسـەندی خەمساردانەی کرد، بەڵام من خۆمم لێی دوور گرت. هەســـتم بە ســـووکەئازارێک دەکرد کە خەریکە لە ناخمدا تەشـــەنە دەکا، ئازارێک کە هەرگیز پەیم بە سەرچاوەکەی نەبردووە.

***

یەکەم جار لە شـــەوێکی باراناویدا چاوم پێی کەوت. کاتژمێر نزیک یەکی شـــەو بوو و لە کتێبخانەکەم چوومە دەر و بەرەو یانەیەکی نزیکی ئەو ناوە ملی ڕێم گرت. وتم ڕەنگە پەرداخێک، مێشـــکم ئارام بکاتەوە و دوای شـــەوێکی تاقەتپڕووکێن لە ژانی ئەدەب، تۆزێک ســـووکنایی بە ناخم ببەخشـێت، بەڵام شـتێک وای لێ کردم خێرا لە یانەکە بچمە دەر، وام زانی مۆبایلەکەمم لە کتێبخانەکە جێ هێشتووە و بە پەلە چوومە دەر. بـاران دەبـاری و چەترم پێ نەبوو. بە بەر بارانەکەدا ڕام دەکرد، کتوپڕ لە کۆڵانەکەی ئەولاوە دەر کەوت و توند خۆمم پێدا کێشا.

شتومەکەکانی بەسەر عەرزەکەدا پەرش بوون و خۆ گەر ئیمەش خۆمان بە یەکتری نەگرتباوە، ئەوا بێ دوودڵی تەختی عەرد دەبووین چەمیمەوە تا لە هەڵگرتنەوەی شتەکانیدا یارمەتیی بدەم و داوای لێبووردن بکەم، ئەویش بە ئینگلیزی وەڵامی دامەوە: «هیچ نییە! کێشە نییە! منیش تۆم نەدی!» کتێبەکانی سەرنجیان ڕاکێشام: لەودیو چاکە و خراپەوە و وەها دوا زەردەشتی نیچە بە ئینگلیزی، لەگەڵ داستانی گلگامێش بە عەرەبی. کە سەرنجم هەڵبڕی و چاوەکانیم بینی، هەستم کرد ژیان سەراپام دەتەنێ. وام خەیاڵ دەکرد کە ڕۆحی خەریکە جەستەی جێ بهێڵێت و لە لەشی مندا نیشتەجێ ببێت. هەر وا دوو خولەکێک لە بەر بارانەکەدا ماینەوە و بێ ئەوەی شەرم دامان بگرێت، نیگای یەکمان دەکرد، بە سەرسووڕمانەوە، بە عەرەبی لێم پرسی:

– پێشتر یەکمان دیوە؟

بە چاوانێکی گەشەوە وەڵامی دامەوە:

– وا بزانم!

– کەی؟

– لە سەردەمێکدا!

– بڕوات بە کارما[1] هەیە؟

– پێم وایە ئێستە بڕوام پێی هەیە!

لەو کاتەدا بزەیەکی کرد و منیش خەندەیەک کەوتە سەر لێوانم کە پێم وایە ڕاستگۆیانەترین خەندەی من بووە. دەستم بۆ ڕاداشت و یارمەتیم دا هەستێتەوە. بە بەر ڕووناکیی دارتەلەکەوە کە لە

---

[1] Karma: لە ئایینی هیندوویزم و بوودیزمدا، وا لێک دەدرێتەوە کە کۆی کار و چالاکییەکانی مرۆڤ لە ئێستە و ڕابردوویدا، بڕیار لەسەر داهاتووی کەسەکە دەدەن. «و. ک»

نەنیشتییەوە وەستابووین، لێی ورد دەبوومەوە. لە قژە ڕەشە خووساوەکەی، لە چاوانی سوورمەئاسای کە لەژێر فشاری لێزمەی بارانەکەدا دەیانکوشا تا بە کراوەیی بمێننەوە. پالتۆیەکی درێژی پۆشیبوو و دەسماڵێکی خوریی ڕەنگاوڕەنگی لە ملییەوە ئاڵاندبوو. کڵاوێکی خوریشی (کە لە هەمان قوماشی دەسماڵەکەی دروست کرابوو) لە سەر کردبوو. جانتایەکی چەرمی ڕەشی کەمانچەشی بە پشتەوە بوو.

بەدەم وردبوونەوەوە لە ڕوخسارییەوە گوتم:

- دەزانی تا خوا حەز بکا ڕوخسارت ئارامبەخشە!

ئاساوانە برۆکانیی بەرز کردنەوە، جا بە گاڵتەوە گوتی:

- ئارامبەخش! لە پیاهەڵداندا شەیتانت پێ ناگا!

منیش لێوبەخەندە لێم پرسی:

- ئاسمان تۆی باراند؟

- ڕەنگە! ئەوە نییە سیاب دەپرسێ چ خەمێکە کە *باران دەبارێنێ*؟

- با لەسەر چ عیشقێک *باران دەبارێنێ* ڕێک بکەوین.

- شیعرەکان دەقی پیرۆزن، کەس بۆی نییە دەسکاری و مامەڵەیان پێوە بکا!

- زۆر باراناوییت!

- بگرە زیاتر ڕەشەباییم.

- چاومان بە یەک دەکەوێتەوە؟

- کێ چووزانێ!

- لە کوێ؟

– ڕەنگە لە سەردەمێکی تردا یەک ببینینەوە!

– یان ڕەنگە قەت چاومان بە یەک نەکەوێتەوە.

– ئەی بڕوات بە کارما نییە؟

– زۆریش بڕوام پێیەتی.

خەندەیەکی ماناداری کرد و هەر وا جێی هێشتم. ڕۆیی و منیش لە دواوە تەماشام دەکرد کە وەک فریشتەیەکی سپی تەم و هەوری دەوریان دابێت، دوور دەکەوێتەوە. فریشتەیەک کە داستانێکی سۆمەریی ڕەسەنی لە باوەش گرتووە و کەمانچەیەکی لە پشت ناوە و هەر بەو جۆرەی کە دەر کەوت، ئاوهاش لە بەر باراندا ون بوو.

***

هەموو جار کە پێی دەڵێم «ئارامبەخش»ی، دەداتە قاقای پێکەنین. وا دەزانێت پێی ڕادەبوێرم، بەڵام من زۆر لە وەسفکردنیدا وردم! کە باسەکە دێتە سەر وەسفی ئەو، هەرگیز گاڵتە ناکەم. جارێکیان پێی گوتم: «ئاخر ئەمە کەی پیاهەڵدانە پیاو بە ئافرەتێک بڵێ ئارامبەخشی. لانی کەم لە یەکەم چاوپێکەوتندا شتی وا بە زمانیدا نایەت.»

منیش بە شەرمەزارییەوە پێم گوت: «مەبەستم ئەوەبوو کە جوانییەکەت ئارامبەخشە!»

ئەوەندە پێکەنی فرمێسک بە چاویدا هاتە خوار. جا هەر جارێک بیری دەنگی پێکەنینی بکەم، پێی دەڵێم کە زۆر ئارامبەخشە، تا لە ناخییەوە بداتە قاقای پێکەنین و ناخی منیش لەگەڵ خۆیدا بهەژێنێت و ملیۆنان کۆتری سپی لە شەقەی باڵ بدەن، بفڕن و بفڕن و بفڕن و بفڕن و تەنیا کاتێک بنیشنەوە کە جێم دەهێڵێت. کەرەتێکیان کە یاریی بە پرچم دەکرد، گوتی: «دەزانی، فێر بووم بڕوا بە پیاوی موونەرم نەکەم! چونکە موونەرمەکان هەمیشە بانگەشەی هەقیقەت دەکەن.»

- هەقیقەت چییە؟

بە گاڵتەوە گوتی:

- ئاکە هەقیقەتی ڕەها کە لەگەڵ تۆدا پێی گەیشتووم، ئەوەیە کە نارامیەخشم.

منیش بە پێکەنینەوە گوتم:

- بگەڕێوە بۆ خۆت، هەقیقەت لە ناخی مرۆڤەکاندایە.

- تێناگەم چۆن هەندێ کات ئۆگەستینیانە[1] لێدەخوڕی، لە کاتێکدا ئۆگەستین باوەڕدار بووە و تۆیش بێباوەڕ.

پێم گوت:

- کێشە نییە، گرنگ ئەوەیە تۆم هەی.

بەڵام لە ناخی دڵەوە دەمزانی کە ئەم ئافرەتە هیچ باوەڕ و کەسێکی نییە. ئافرەتێکە هەموو بیروباوەڕ و بیرۆکەیەکی سەرەتایی و پاساوێکی تێپەڕاندووە. خانمێکە لەنێوان باڵاترین خاڵی پەقین و گوماندا دەتەپڵێتەوە، نە لەگەڵیدا بەر دەبەیت و نە دەشتەوێ سوچیاریی[2] بکەیت. دووبارە و دووبارە پێت بە هەمان تەڵەی ئارەزوو و دەسەڵاتەوە دەکات، تا دژیەکییەکانی ئەم یارییەی، جرتوفرتت لەگەڵدا بکەن و نەگەیتە هیچ چارەسەرێک.

ئەم خاتوونە شادم دەکات، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دڵتەنگییەک لە ناخمدا دەوروووژێنێت و منیش نامەوێت لووتم بە لووتی دڵتەنگییەوە بنەقێت، چونکە ژیان نە ڕێزی مرۆڤە غەمگینەکان دەگرێت، نە

1. Augustine of Hippo (٣٥٤-٤٣٠ پێش زایین) نووسەر و فەیلەسووفێکی لاتینیی خەڵکی ئاگاستە، کە دەکاتە جەزائیری ئێستە و بە یەکێک لە گرنگترین کەسایەتییەکانی ئایینی مەسیحی لە مێژوودا دادەنرێت. «و. ک»

2. ئاموژگاری.

خەمەکانیشیان. منیش پیاوێکم کە پێویستم بەوەیە ژیان ڕێزم بگرێت، مرۆڤێکم مل بۆ ژیان کەچ ناکەم، تەنانەت گەر وەک خانمە فەیلەسووفەکە دەڵێت: *با ژیان تێکوپێکیشم بشکێنێ، گرنگ نەروخێ* خۆڕاگر دەمێنمەوە و نەبەزیم.

هەندێک جار هەست دەکەم نووسەرەکان بۆ ئەوە دەنووسن تا پەیامێکی تایبەت بەوانە بگەیەنن کە بە ژیانیاندا تێپەڕیون، ئەوەش منیش زۆر لەناو دێڕەکانمدا دەیبینمەوە. لە دێڕەکانمدا تینوێتی، خەم، بێئومێدی، ترس، خۆشەویستی، تووڕەیی خوێنخواز و ناچارانەی خۆمی بۆ بەیان دەکەم. ئێمە نە ئەو شتانە هەڵدەبژێرین کە دەینووسین، نە دەشیانافرێنین، بەڵکە بە شێواز و داڕشتنی تایبەت بە خۆمان، وشەکان دەگوازینەوە سەر پەڕەکان. نووسین سرووشێکە کە کەس نازانێت لە کوێوە بۆمان دێت، بەڵام دواجار نووسین دەنگی بڵندی منە. کە عاشق دەبین، هەرچەند هاوارکردن بێهوودە و بێئەنجامیش بێت، بەڵام هەر پێویستە پڕ بە گەروومان هاوار بکەین، تا چارەنووس بترسێنین و ئاڵنگاریی جیهان بکەین.

هەندێک جار بیر دەکەمەوە کە چارەنووسەکان، سۆسەکان لە زارمانەوە دەدزن تا وەک ڕووداوگەلێکی داهاتوو بیاننووسنەوە. هەر لەبەر ئەمەشە کە ئێستە زۆر بە پارێزەوە مامەڵە لەگەڵ چارەنووسدا دەکەم. ئێستاکە باسی شتانێک ناکەم کە چارەنووس لێمیان بدزێت و لە دەفتەرچەی داهاتوودا بیاننووسێتەوە و دواتریش بێ ئەوەی خۆم هیچ ویستێکی بەڕاستەکەڕانیانم هەبێت، ئەو لە خۆوە بەدییان بهێنێت بۆم.

ڤۆلتێر کە بڕوای وا بوو *مادام* قەڵەمێکی بە دەستەوەیە، ئیدی گرنگ نییە *تاجێکی* بە سەرەوەیە *یاخود نا*. چاک دەرکی بەوە کردبوو کە نووسین نهێنیی نەمرییە. زانیویەتی کە ئەوە کارە ئەدەبییەکانمان بە نەمری دەمانهێڵنەوە، یا ئەم نەمرییە لە ژیانیدا بەختەوەریشمان

نەکات. دواجار خەم و پەژارە، ڕێگەی مرۆڤە مەزنەکانە. مۆری نەهامەتی لە نێوچەوانی هەموو کەسێکی داهێنەر دراوە، چونکە ئەو باجەیە کە مرۆڤە مەزنەکان دەبێت بیدەن. هیچ ئەمرییەک بە خۆرایی نییە و هیچ داهێنانێکیش بێ نەهامەتی نابێت. هەرگیز بەختەوەری پاڵمان پێوە نانێت دەقێکی ئەدەبی بنووسین، ئاخر ئەدەب لێوبەبارمان دەکات، دەمانخاتە سەر قوڵپی گریان، ئەدەب ڕیشەیەکی زۆر قووڵی لە فەلسەفەی گریاندا هەیە.

پێش دوو دەیە کە ڕیازم جێ هێشت، پێم وا بوو گریەوزاری پیشەی ئافرەتانە، بەڵام ژیان فێری کردم کە گریان پیشەی مرۆڤە سەرڕاستەکانە. هەرچەند خۆم بە سەرڕاست نازانم، بەڵێ پێم وا نییە سەرڕاست بم و باکیشم پێی نییە. لە سەردەمێکدا کە هیچ پێوەرێک بۆ سەرڕاستی نەماوەتەوە، کێ باکی بەوە هەیە سەرڕاست بێت. لەم سەردەمەدا، ڕاستگۆ و تەڵەکەچییەکان لە یەک جوێ ناکەینەوە. وای لێ هاتووە گشتیان شێوەیان لە یەک دەچێت و خەریکە ڕەفتاریشیان وەک یەکی لێ دێت.

هەست دەکەم ئەوەم تێپەڕاندووە کە ژیانم بەوەوە بکوژم بۆ ئەوانی تری بسەلمێنم کە مرۆڤێکی باشم، هەر بەو جۆرەی کە زۆربەی زۆری پیاوانی عەرەب ژیانیان لەوەدا بە هەدەر دەدەن بۆ ئەوانی تری بسەلمێنن کە باشن. وەک بڵێیت هەر کە لە سکی دایکیان هاتوونەتە دەر، وەها تۆمەتێک درابێتە پاڵیان و ئەمانیش هەوڵی بەدرۆخستنەوە و سەلماندنی پاکیێتیی خۆیان بدەن.

من سوورم لەسەر... یانی دانی پێدا دەنێم و خۆشم بەوەوە هەڵدەکێشم کە هەندێک ڕەفتاری چەوتم هەن! هیچ شەرم لەم ڕەفتارانەم ناکەم، چون نە دەمترسێنن، نە وام لێ دەکەن خۆم بە کەم بزانم. پیاوسالاری بەڵگاندنی ناوێت، بەڵام مرۆڤدۆستی شتێکە هەمیشە پێویستی بە سەلماندنە. گەر هەندێک کاری چەوت بکەم،

مانای وا نییە مرۆڤێکی بێئەخلاق بم، ئەم شتانە هیچ لە مرۆڤدۆستیی من کەم ناکەنەوە، بەڵکە بە پێچەوانەوە، هەست دەکەم بە جۆرێک لە جۆرەکان پاڵپشتیی دەکەن و منیش کەسێکم هەموو ئەو شتانە پیرۆز رادەگرم کە پاڵپشتیی مرۆڤدۆستیم دەکەن.

شەوێکیان، لە خانمەنووسەرێکی هاورێیم پرسی، بۆچی دەنووسی؟

وەڵامی دامەوە: چونکە نووسین بەئازارە و منیش چێژ لە *ئازارەکەی دەبینم!*

خەندەیەکم کرد و بێدەنگ بووم. بیرم کردەوە چەندە سێکس و نووسین لە یەک دەچن، بیرم لە تای نووسین دەکردەوە کە هەر ئەوەندەی گرتم، ئیدی چاوم لە ئاست هەموو شتێکی تردا کوێر دەبێت، وەک چۆن ئەو کاتەی تای هەوەس دام دەگرێت، جگە لەو جەستەیەی کە لەنێوان باسکەکانمدایە، چاوم یەک شتی تر نابینێت.

چەندە بۆ خۆشەویستی گرم تێ بەر بووە، هێندەش بۆ نووسین! منیش وەک زۆربەی نووسەرە مەزنەکان... چونکە زۆرێکیان لەپێناو خۆشەویستیدا نووسین دەکەنە قوربانی و لەپێناو نووسینیشدا خۆشەویستی!

ئەو دۆستەم کە چێژ لە ئازاری نووسین دەبات، هەمان ئەو مرۆڤەیە کە لەسەر تەختەخەو هار دەبێت، چێژ لە ئازار دەبینێت و لەو ساتەدا جگە لە مێبوونی خۆی، دەستبەرداری هەموو شتێک دەبێت!

نووسین هاربوونە، سەرشێتی، وەحشێتی، شۆڕش، هەڵگەڕانەوە و ملنانە! نووسین پێکهاتنەوە و دابڕانەوە.

پێکهاتن لەگەڵ خۆمان و دابڕان لە خۆمان. ئەوە وەحشێتییە کە ئەلف و تا و عەین و قاف بە دوو وشە کە لە هەمان کۆمەڵەپیت پێک

هاتوون، کو دەکاتەوە. تەنیا و تەنیا نووســینیش دەتوانێت مانای ئەم دوو وشەیە بەیەکەوە ببەستێتەوە.

من نە بۆ ئەوە دەنووسم پاکێتیی خۆم بسەلمێنم، نە بۆ ئەوەش لە ڕێیەوە حەزەکانم بلەوەڕێنم. دەنووســـم تا هەناســـە بدەم، بژیم، تا بووم و بزانم کە ســـبەینی شـــتێک چاوەڕێمە! لەم ژیانەدا، جگە لە مۆسیقا و ئەدەب ئاشتەبای خودا شک نابەم، بەڵام چارەنووسی نووســەر و مۆســیقارەکان، هەمیشــە دەردیســەرییە. شــۆپان[1] کە لە سیوتو ســاڵیدا مرد و مۆزارتیش کە سیوپێنجەمین ســاڵی تەمەنی پڕ نەکردەوە و گیانی ســـپارد، دوو مرۆڤی بەهرەدار بوون. بێئەندازە بەهرەدار بوون و ژیان و چێژ و جوانترین خەونەکانیان لە مۆســیقادا دەبینییەوە. بەڵام مەرگ زۆر بەدیارییانەوە نەوەســـتا، وەک بڵێیت مەرگ تەنیا ئەوانە بکوژێت کە شـــەیدایی و پێشـــکەوتن و عیرفان و ڕووناکی لە ژیاندا بڵاو دەکەنەوە.

ئەمڕۆکە دەزانم کە ئەو چارەنووسانەی لەپێناویاندا خۆشەویستی، هونەر، ئەدەب و ئەقڵمان لە دەست دەدەین، چارەنووسگەلێکن شایەنی ڕێزن. دەزانم کە نووســـین جۆرێکە لە شـــێتی، بەس ئەوەی کە هونەرمەندێک یاخود نووســـەرێکی چاونەترس هاوبەشـــی ژیانت بێت، شێتییەکی بێوێنەیە.

هەمیشـــە بیر لە واســـینی ئەعرەج[2] دەکەمەوە کە لە *تاجەگوڵینەی یاسەمینا* دەڵێت: *چەند ســەختە ئافرەتێک عاشقی هونەرمەند یاخود*

---

1. Frédéric François Chopin فریدریک شـۆپان (١٨١٠-١٨٤٩): ئاوازدانەر و پیانۆژەنێکی بەناوبانگی پۆڵەندیی سەردەمی ڕۆمانتیک بووە. «و. ک»

2. واسینی ئەعرەج: ساڵی ١٩٥٤ لە گوندی سەیدی بوجنانی تەلەمسانی جەزائیر لە دایک بووە. واسینی مامۆستای زانکۆ و ڕۆماننووسە. هاوکات بە یەکێک لە دیارترین ڕۆماننووســەکانی عەرەب دادەنرێت و تا ئێســتە لەو بوارەدا دەیان خەڵاتی ئەدەبیی بۆ بەخشراوە. «و. ک»

نووسەرێک بێت کە ئارەزووی ژیان لە کەللەی داوە! بیر دەکەمەوە، ئاخۆ قەت بە بیری ئەم ئەدیبە گەورەیەی جەزائیردا نەهاتووە کە چەند بەسوودە پیاوێک عاشقی خانمەهونەرمەند یان نووسەرێک بێت کە ئارەزووی ژیان لە سەری داوە؟ یان ئەویش وەک من پێی وایە کە ئەوە خانمە هونەرمەند و نووسەرەکانن شەکەتی و شێتی و دەردەداری تێکەڵ بە ژیان دەکەن؟

جیهادم بیر هاتەوە کە لە شەوێکی ناخۆشدا جارێکیان لێم پرسی:

– چ شتێک ئافرەتان و شێتی لە یەک جیا دەکاتەوە؟

دەستی بۆ سەر شانم درێژ کرد و تاڵەقژێکی هەڵگرت کە بە پاڵتۆ زستانییەکەمەوە نووسابوو، جا بە بەرچاومەوە هەڵی بڕی و بە کورتی گوتی:

– تاڵەموویەک!

جیهاد ڕاستی کرد، ئەوە ئافرەتانن کە شێتمان دەکەن! هەر ئەوانن واقعمان لێ دەدزن و لە هەموو یەقینێک دامان دەماڵن. ئافرەتان خۆشترین هۆکاری چێژوەرگرتن و گەمژەییمانن، بەسوێترین برین و دڵگیرترین ساتەوەختەکانمانن، باوەڕ و کوفر، ملکەچی و لادانەکانمانن.

ئەوە خانمانن کە گوڕوتین بە بەر ژیانماندا دەکەن، جا خۆیانی تێدا دەبیننەوە و بە ملکەچییەکی ساختەوە تێکەڵی دەبن، تا وا بیر بکەینەوە کە ئەوە ئێمەین ئەم ژیانەمان ئافراندووە و هەر ئێمەشین کە گەمژانە –هەڵبەتە گەمژەییەک کە لە وێنەی نییە– بەڕێوەی دەبەین.

ئافرەتان لە ترۆپکی عیشقدا کوێر و هەڵەشە دەبن، بەڵام پیاوان لەم حاڵەتەدا ئەقڵ لە سەریاندا نامێنێت! بە هەرچی چیرۆکی مێژوویدا هەیە بگەڕێی، دانەیەک بۆ دەرمان نادۆزیتەوە کە تێیدا ئافرەتێک عیشق شێتی کردبێت. خانمان وێرای لادانە سۆزدارانەکانیان پارێزگاری لە ئەقڵیان دەکەن، تەنانەت لە دژوارترین حاڵەتەکانیشدا

ڕەنگە ئافرەت لەبەر خاتری عیشق ناوبانگ، خۆشبەختی، کەرامەت و حورمەتی خۆی و بگرە خێزانەکەشی بکاتە قوربانی، بەڵام هەرگیز ئەقڵی خۆی ناخاتە مەترسییەوە، ئەگەرچی پەکاریشی نەهێنابێت، ئاخر ئافرەتان بە دەگمەن لە عیشقدا، کەڵک لە ئەقڵیان وەردەگرن.

هەندێ ئافرەت وا لە پیاو دەکەن هیچ ئارەزوویەکی بۆ ژیان نەمێنێ، هەندێکی تریش وای لێ دەکەن باوەش بە ژیاندا بکات. دڵدارەکەی منیش تێکەڵەیەکە لەم دووانە، هەم دەمژیێنێ، هەم دەممرێنێ! کە لام نییە؛ حەز دەکەم بمرم و ئازاری ئەو جودابیەم لە کۆڵ ببێتەوە، کە لاشمە؛ دەترسم ساتەکانی تەمەنم خێرا تێبپەڕن و دەپارێمەوە بسرەوێ؟

دەڵێن گوایە تەمەنی پەیوەندییە کراوەکان، لە تەمەنی ژیانی هاوسەرێتی درێژترە، چونکە ئەو بارودۆخەی کە تێیدا مرۆڤ ترسی لەدەستدانی ئەوی تری هەیە، وا دەکات پەیوەندییەکە هەمیشە لە تروپکی گەرموگوڕیدا بمێنێتەوە، بەڵام هەر ئەم ترسەیە کە لە خەو و هەناسەدانمان دەکات، ئەم ترسی لەدەستدانە دەمانخاتە ناو گێژەڵووکەی ناسەقامگیری و، بە پێخاوسی بەسەر بڵێسەی ئاگری شەیداییدا ڕێ دەکەین و چێژ لە گەرمییەکەی دەبەین، تا ئەو کاتەی دەبینە قەرەبرووت و هەموو هەستەکانمان لە دەست دەدەین.

منیش پیاوێکم کە گەر هەستەکانم نەبن، ژیان دەمشارێتەوە. مرۆڤێکم جگە لە هەستەکانم، هیچ شتێکی تر بە زیندوویی نامهێڵێتەوە. ئەوە هەستەکانمن هانم دەدەن بنووسم و مۆسیقا بژەنم. هەڵبەت تەنیا پارچەیەک دەژەنم کە بە تاسەی بیستنییەوەم، دەقێک دەنووسم کە خوێندنەوەی سەرسامم بکات.

*گەر خوازیاری خوێندنەوەی کتێبێکی و هێشتا نەنووسراوە، ئەوا خۆت بینووسە!*

هەموو جار کە تیا دەمێنم و نازانم چی بنووسم، سەیری وتەکەی تۆنی مۆریسن[1] دەکەمەوە کە زۆر ورد لەسەر قوتووی جگەرەکەم نەخشێنراوە. نازانم بۆ ئەم وتەیەم لەسەر ئەو قوتووە نەخشاندووە! هەندێک جار بیر دەکەمەوە کە وتەیەکی وا «جوان» دەبێت بەسەر ڕووی کۆنترین کتێبخانەکانی جیهانەوە بنووسرێت نەک قوتوویەکی پلاتینی جگەرە. هەست دەکەم بۆ ئەوە لەسەر قوتووەکە نەخشاندوومە تا هەمیشە لە بەرچاوم بێت، تا زوو زوو بیخوێنمەوە و دایم ئیلهامم پێ ببەخشێت.

بەس خۆ ئێستە نازانم دەمەوێت چی بخوێنمەوە تاکوو بینووسم! هەنووکە لە پەڕەکانی کۆتاییدام. سەدان بیرۆکە لە سەرمدا خوول دەخۆن و ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر پێکدا دەدەن. ئەم شۆڕشە تەنیا ڕۆمانەکەم بەجۆشوخرۆش ناکات، بەڵکە خەریکە شێتم بکات، تووڕەییم دێنێتە کوڵ، ئاگر بەر دەداتە بیرۆکەکانم و هەستەکانم لە باڵاترین دوو ئاستی دژبەیەکدا یاری دەکەن، لەنێوان توندی و شلی، ڕەقی و ناسکی! زۆربەی کات هەستەکانم بێڕادە لادەرانەن.

کاتێک دەنووسم، هەست دەکەم بارێکی گران بەسەر شانمدا دراوە. کە دەنووسم، هەست دەکەم لە پێشبڕکێیەکی دووروودرێژی ماراسۆندام، ڕادەکەم، ڕادەکەم و ڕادەکەم تا دەگەمە خاڵی کۆتایی و تێک دەشکێم.

هەموو جار کە لە نووسینی ڕۆمانێک دەبمەوە، بە بینینی دابەزینی ئەو هەموو کێشەی جەستەم سەراسیمە دەبم، وەک ئەوەی لە کاتی

---

١. Toni Morrison: تۆنی مۆریسن (١٩٣١-٢٠١٩) خانمەڕۆماننووسێکی ئەمریکیە و هاوکات لە دیارترین خانمەنووسەرەکانی جیهانە. یەکەم ڕۆمانی خۆی ساڵی ١٩٧٠ لەژێر ناونیشانی «شینترین چاو»دا بڵاو دەکاتەوە، بەڵام زیاتر بەهۆی ڕۆمانی «گۆرانیی ئاشتی»یەوە ناوبانگ دەر دەکات و جیا لەمە، لە ساڵی ١٩٩٣دا خەڵاتی نۆبڵی پێ دەبەخشرێت. «و. ک»

نووسـینداً، تەنیا پیت و وشـە بچێتە زارمەوە. نووسین هەر تەنیام ناکات و بەس، بەڵکە بە گڕ هەسـت و بیرۆکەکانی خۆممدا دەدات. جا بێ ئەوەی باکم بە جەسـتەم بێت کە ڕۆحمی لە خۆیدا پەنا داوە و بە زیندوویی هێشتوویەتییەوە، بە تەواوی ڕۆدەچمە دونیای نووسینەوە.

لە قۆناغی نووسـینداً، تامی خۆراک ناکەم. جگەرە بە جگەرە پێ دەکەم و شـلەژاو و هەڕەمەکیانە دەخوێنمەوە. تا سـەر ئێسقان وەحشیانە مۆسیقا دەژەنم و تەنیا کاتێکیش چاوم دەچێتە خەوەوە کە زۆر مەست دەبم، یاخود بەسەر پیانۆکەوە لە پەلوپۆ دەکەوم و دوای چوار پێنج کاتژمێر خەبەرم دەبێتەوە و دەبینم ئاسـەواری دوگمەکان بە ڕوخساری شەکەتمەوە دەرچووە.

ئەم شـێتییەی کە ئەزموونی دەکەم، تا دێت خراپتر دەبێت، وەلێ خۆ ناشتوانم جڵەوی بگرم. کە باس دێتە سەر نووسین، جڵەوی خۆمم پێ ناگیرێت، بەدەم نووسینەوە هێزێکی شاراوە دەمجووڵێنێت و زۆر بۆهیمییانە لێدەخورم و شەرمیشی لێ ناکەم، چونکە هەمیشە بڕوام وا بووە کە سرووشـی نووسین جگە لە بارێکی جادویی هیچی تر نییە. نووسـەرەکان کۆمەڵێک مرۆڤی جادولێکراون و هەر کەسێش جادوی نووسینی لێ بکرێت، هیچ نزا و چارەسەرێک دادی نادات.

بێتام خووم بە مۆسـیقا و ئەدەبەوە گرتووە و بە هونەرێکی جوانیان دەبینم، بەس ئێناگەم بۆ هەردووکیان لە یەک کاتدا مێشکم داگیر دەکەن. کە دەنووسم، بەسەر سەرمەوە نۆتەمۆسیقییەکان سەما دەکەن، کاتێکیش دەژەنم، گڕکانی بیرکردنەوەکانم دەتەقێتەوە و تەنیا کاتێک هێور دەبێتەوە کە بیرکردنەوەکانم لە شـێوەی مرەکەبدا دەڕژێن.

سـەرباری «شـۆپانیسـت»یم و ئەو ڕێز و دڵسـۆزییەی کە بۆ شـۆپانی مەزنم هەیە، بەم دواییـانە مەیلم چووەتە سـەر ئاوازە خۆرهەڵاتییەکان. جگە لەم ئاوازانە، عەرەب نەیتوانی و ناشـتوانێت

ئاوازگەلی وەها ئەویندارانە بئافرێنێت. بەڵێ، جگە لەم ئاوازانە! حەز بە دەنگی عود و قانوون[1] دەکەم، شیعرە ئەندەلووسییەکان، ئاوازە نەهاوەندییەکان[2]، نۆتە شەمسییەکان. دوور لە کەشی باخ و هایدن و مۆزارت و بیتهۆڤن، دوور لە شۆپانی مەزنم.

نازانم کە داخۆ ئەم مەیلە بەتینەم ئاماژەیەکی ترسناکە یان نا، بەڵام بەم دواییانە سڵ لە هەموو ئەو شتانە دەکەمەوە کە بە عەرەببوون و ڕۆژهەڵاتیبوونی خۆمەوە دەمبەستنەوە. دواجار مۆسیقا شوناس و ڕەگوڕیشەیەکی نەتەوەیی نییە، تەنانەت گەر بیدەینە پاڵ خاک یاخود ڕەچەڵەکیکیش. کەوایە بۆ زیرەم لە مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی کردووە، وەک بڵێیت دەترسم سەرم بە قوڕدا بکات و بمباتەوە سەر خۆشەویستییەک کە پێم وایە بە تەواوی ڕەگوڕیشەیم لە دڵمدا هەڵکێشاوە؟

حەز لە «ئەی ساقی»ی ئیبن زوهر[3] دەکەم، «بارانت بۆ باری»ی ئیبن خەتیب[4]، لەگەڵ «کە دەستی کردە لەنجەولار» کە هێشتا نازانری هی کێیە.

---

١. قانوون: ئامێرێکی مۆسیقیی ژێداری ڕۆژهەڵاتییە و بە باوکی هەموو ئامێرە مۆسیقییە عەرەبییەکانی تر دادەنرێت. «و. ک»

٢. جۆرە ئاوازێکی ڕۆژهەڵاتین، بۆ هەردوو جۆری گۆرانیی خەفەتبار و شادیهێن دەست دەدەن. ئەم جۆرە ئاوازە بە ناوی شاری نەهاوەندی ئێرانەوە ناو نراوە. «و. ک»

٣. ئیبن زوهر (١٠٩٤-١١٦٢) فیزیازان، نەشتەرکار و شاعیرێکی عەرەب بووە، لە شاری ئیشبیلییە لە دایک بووە. لەگەڵ هەردوو زانا ئیبن ڕوشد و ئیبن توفەیل، باشترین پزیشک و زانای سەردەمی خۆی بووە. «و. ک»

٤ئیبن خەتیب (١٣١٣-١٣٧٤): نووسەر، مێژووناس، فیزیازان، شاعیر، سیاسییەکی عەرەب بووە،. لە ئیسپانیا لەدایک بووە و لە وڵاتی مەغریب کۆچی دوایی کردووە. زۆربەی شیعرەکانی بەسەر دیواری کۆشکی سووری غەرناتەوە هەڵکۆڵراون. «و. ک»

بیری مۆسیقای خەفەتبار، قەسیدە ڕۆحانییەکان، شیعری عیرفانی و ماجن[1] دەکەم، ئارەزووی شەوانی بەزمورەزمی عەرەبی لە کاڵەی داوم کە لە یەک کاتدا هەم پڕ لە هەستوخوستن، هەم زۆریش خەمگین.

عەرەبەکان گەلیک نەگبەتن، چونکە شتێک لە خاک و مێژووەکەیان، هەرچەند هەوڵی سڕینەوەی بدەن، هەر تیایانا دەمێنێتەوە. عەرەبگەرایی نەخۆشییەکی بۆماوەییە و چارەسەری نییە، نەخۆشییەک کە لە هەر کوێ بین و بۆ هەر کوێ بچین، وەک سێبەر پێمانەوە نووساوە. تەنانەت گەر بمانەوێت و هەوڵ و تەقەللاشی بۆ بدەین، ناتوانین لە کۆڵ خۆمانی بکەینەوە.

مۆسیقای عەرەبی جۆرە جادویەکە کە مرۆڤ ناتوانێت لێی تێبگات و جێگرەوەشی نییە. منیش پیاوێکم کە تەنیا و تەنیا جادوی هونەر کارم تێ دەکات.

هەندێک پارچەمۆسیقا هەن، پەلکێشی ئەودیو گەردوونم دەکەن. هەندێک پارچە هەن، بێ چەندوچۆن بەرزەخین، چونکە کە گوێیان بۆ دەگریت، هەست دەکەیت لە مەوداگەلێکی بێکۆتادا گیرت خواردووە.

هەندێک پارچە دڵمان دەبەن، دەمانمرێنن و گیانمان بە بەردا دەکەنەوە! بیرمە یەکەم جار کە گوێم لە *ڕێگەی ئاوریشمی کیتارۆ*[2] گرت، بە ڕادەیەک بۆنوبەرامەی عیرفانی بە شەوەکەمدا پژاند کە

---

[1] جۆرە شیعرێکە تێیدا شاعیر وەسفی دلدارەکەی دەکا. غەزەلی ماجن دەبێ بە دوو بەشەوە: غەزەلی خاوێن، غەزەلی ڕووت. غەزەلی خاوێن ئەوەیە شاعیر بێ ناوهێنان و وەسفکردنی ئەندامەکانی جەستەی یار، بە دلدارەکەیدا هەڵ بدا، بەلام لە غەزەلی ڕووتدا، شاعیر سڵ لە هیچ ناکاتەوە و بە ئاشکرا و بە شێوەیەکی ئیرۆتیکی وەسفی جەستەی یارەکەی دەکا. «و. ک»

[2] Silk Road: ڕێگەی ئاوریشمی گۆرانییەکە لە لایەن کیتارۆی هونەرمەندی یابانییەوە لە ساڵی ١٩٨١دا بلاو بووەوە. «و. ک»

خستمییه گریان. ئەو شەوە هەستم کرد ڕەقیعم[1] تێپەڕاندووە. جا بە قەیدووم و ماروم و ئەرفلون و هەیفوف و عەرووس و ئەنشان عەجمائیشدا تێپەڕیم. سوێند دەخۆم ئەو شەوە هەستم کرد هەر حەوت تەبەقەکەی ئاسمانم بڕیوە، هەر حەوتی!

ئێستەش بە هەمان ئارەزوو و پێویستیی ڕۆحییەوە، گوێ لە ڕێگەی ئاوریشم دەگرم.

مۆسیقا حاڵەتێکە تێی ناگەین، نەخێر، تێی ناگەین! حاڵەتێکە تێیدا دەکرێت هەست بە هەموو ئەو شتانە بکەین کە دەشێت هەستیان پێ بکرێت. مۆسیقا لە هەموو شتێکی ساختە دامان دەماڵێت، ساختەکاری و گزی و نمایشی درۆیینەمان لە کۆڵ دەکاتەوە. کتومت وەک نووسین، مۆسیقاش حاڵەتێکی ئافراندنی مرۆڤدۆستییە، چونکە دانانی پارچەمۆسیقاش وەک نووسینی کتێب وایە، لە هەردوو بارەکەدا پێویستە لەگەڵ خۆتدا پێک بێیتەوە و جیا لە خۆت، هەموو شتێک وەلا بنێیت. دەبێت ڕۆحت لە زیندانی جەستەت ئازاد بکەیت، تا ئەو کاتەی بەرز دەبێتەوە و دەبێیە هەڵم! ئیدی ئەوکات شکۆدار دەبیت و جگە لە شکۆداری، شتێکی ترت بە نسیب نابێت!

ئەویش وەک منە! ئەخۆشی مۆسیقایە.

ڕۆژێکیان هەموو پارچە بڵاوکراوەکانی ئەندری ڕیۆی[2] مۆسیقاری مەزنی هۆڵەندیم بە دیاری پێشکەش کرد، چونکە دەمزانی حەزی لە کەمانچەیە. شەوەکەی پێکەوە دانیشتبووین، عەزییەیەکی سپیی پۆشیبوو و دەتگوت بووکێکی تاجلەسەرە. لەسەر مێزی نانخواردن

---

[1] ڕەقیع یەکەم تەبەقەی ئاسمانە، بە شوێنیشیدا تەبەقەکانی تر دێن کە بریتین لە قەیدووم، marووم، ئەرفلون، هەیفووف، عەرووس، عەجما. «و. ک»
[2]. Andre Rieu (١٩٤٩-١٩٧٥): ئەندری ڕیۆ، کەمانچەژەنێکی بەناوبانگی هۆڵەندییە. زیاتر لە ژەنینی ئاوازی واڵتزدا بەناوبانگە و لەگەڵ یۆهان شتراوس هەولیان دا لە ڕێی گەشتی کۆنسێرتییەوە واڵتز بە دونیا بناسێنن. «و. ک»

بووین و بە شێوازێک کە شیاو نەبوو مرۆڤ نیواران زەیتوون و پەنیری بێ بخوات، بە چەتاڵ و چەقۆ زەیتوون و پەنیری دەخوارد و بە بێدەنگییەکی سەیرەوە، گوێمان بۆ پارچەیەکی شۆپان شل کردبوو.

گوتی:

- پارچەیەکی جوانە!

لێم پرسی:

- دەزانی هی کێیە؟

بێ ئەوەی تەماشام بکات، خەندەیەکی کرد و وەڵامی دامەوە:

*nocturne in c sharp minot by chopin.*

سەراسیمە بووم و کونجکۆڵیی ورووژاندم! هیچ شتێک شان لە شانی ئافرەتێک نادات کە عاشقی مۆسیقایە و لێی تێدەگات و، ڕەنگە بشێئافرێنێت! بگرە هیچ شتێک ناگات بە تۆزی پێی ئافرەتێکدا کە پارچەکانی شۆپان دەناسێتەوە و دەزانێت کە بە چ نۆتەیەکی مۆسیقی ژەندراون.

گوتم:

- یەکەم جار کە چاوم پێت کەوت، کەمانچەیەکت لە پشت نابوو!

- حەزت لە کەمانچە نییە؟

- حەزم لە نەیە!

ئاماژەی بە پەنجەکانی دەستم دا و گوتی:

- ئەی پیانۆ؟!

زیرەکییەکەی خەندەیەکی لەسەر لێوم نەخشاند، هەستامەوە و بەرەو کتێبخانەکەم کەوتمە ڕێ و پرسیم:

– بەهەرحال، زۆردەمێکە دیارییەکم بۆ هێناوی، بەڵام هەموو جار بیرم دەچێ بتدەمێ! با بڵێین بەر لەوەی بتدەمێ، جێم دەهێڵی.

بە گاڵتەوە گوتی:

– ڕەنگە تا دەگەڕێیتەوە من لێرە نەمابم!

دیارییەکەیم هێنا. ئەو دیارییەی کە چەندان هەفتە لەناو کتێبخانەکەدا چاوەڕێی ئەو بووە بمێنێتەوە و بیبات. هیچم نەگوت. هەر وا لە بەردەمیدا دامنا و چوومەوە سەر کورسییەکەم.

کە سنووقی دیارییەکەی کردەوە، بزۆکانیی بە سەرسامییەوە هەڵبڕین و تاسەمەندانە کەوتە هەڵدانەوەی ئەلبوومەکانی ئەندری ڕیۆ.

– ئەندری ڕیۆ.

– وای بۆ چووم حەزت لە *واڵتز* بێ.

– بۆچی بە دیاریکراوی واڵتز؟

– ڕۆژێکیان کە گوێمان لە «شەوانی ئەنەس لە ڤییەنا[1]» دەگرت، گوتت کە حەزت لەو جۆرە مۆسیقایەیە، ئی کەسیش هێندەی ئەندری ڕیۆ لە واڵتزدا شارەزا نییە.

– چیی تریشم بە دڵە؟

– ئەی تۆ دەزانی کە من کێم بە دڵە؟

– مممم، *شۆپان*، *ڤۆڵتێر*، *فەیرووز*، *دەروێش*، *فرانک سیناترا*[2]، *بیتڵز*، *چای ئینگلیزی*، بلووسەکانی *ڕاڵف لۆرین*، قاتی ئەرمەنی!

---

١. گۆرانییەکی عەرەبییە، ئەحمەد ڕامی دەقەکەیی نووسیوە، فەرید ئەترەش ئاوازی بۆ داناوە و ئەسمەهانیش لە فیلمی «عیشق و تۆڵە»دا گوتوویەتی. «و. ک»

٢ Frank Sinatra (١٩١٥-١٩٩٨): فرانچیس ئەلبێرت سیناترا گۆرانیبێژ و ئەکتەرێکی بەناوبانگی ئەمریکییە. خێزانەکەی ئیتالی بوون و ئەوکات وەک پەنابەر چووبوونە ئەمریکا، بەڵام خۆی لە نیو جێرسی لە دایک بووە. یەکێک لە دیارترین ناوەکانی سااڵنی

– بەهەرحاڵ، زۆردەمێکە دیارییەکم بۆ هێناوی، بەڵام هەموو جار بیرم دەچێ بتدەمێ! با بڵێین بەر لەوەی بتدەمێ، چیم دەهێنی

بە گاڵتەوە گوتی:

– ڕەنگە تا دەگەڕێیتەوە من لێرە نەمابم!

دیارییەکەیم هێنا. ئەو دیارییەی کە چەندان هەفتە لە ناو کتێبخانەکەدا چاوەڕێی ئەو بووە بمێنێتەوە و بیبات. هیچم نەگوت، هەر وا لە بەردەمیدا دامنا و چوومەوە سەر کورسییەکەم.

کە سنووقی دیارییەکەی کردەوە، برۆکانیی بە سەرسامییەوە هەڵبڕین و تاسەمەندانە کەوتە هەڵدانەوەی ئەلبوومەکانی ئەندری ڕیۆ.

– ئەندری ڕیۆ.

– وای بۆ چووم حەزت لە *واڵتز* بێ.

– بۆچی بە دیاریکراوی واڵتز؟

– ڕۆژێکیان کە گوێمان لە «شەوانی ئەنەس لە ڤییەنا[1]» دەگرت، گوتت کە حەزت لەو جۆرە مۆسیقایەیە، ئی کەسیش هێندەی ئەندری ڕیۆ لە واڵتزدا شارەزا نییە.

– چیی تریشم بە دڵە؟

– ئەی تۆ دەزانی کە من کێم بە دڵە؟

– مممم، *شۆپان*، *ڤۆلتێر*، فەیرووز، دەرویش، *فرانک سیناترا*[2]، بیتڵز، چای ئینگلیزی، بلووسەکانی *ڕاڵف لۆرین*، قاتی ئەرمەنی!

---

١. گۆرانییەکی عەرەبییە، ئەحمەد ڕامی دەقەکەیی نووسیوە، فەرید ئەترەش ئاوازی بۆ داناوە و ئەسمەهانیش لە فیلمی «عیشق و تۆڵە»دا گوتوویەتی. «و. ک»

٢ Frank Sinatra (١٩١٥-١٩٩٨): فرانچیس ئەلبێرت سیناترا گۆرانیبێژ و ئەکتەرێکی بەناوبانگی ئەمریکییە. خێزانەکەی ئیتالی بوون و ئەوکات وەک پەنابەر چوونە ئەمریکا، بەڵام خۆی لە نیو جێرسی لە دایک بووە. یەکێک لە دیارترین ناوەکانی ساڵانی

پێکەنیم و گوتم:

- بە چلەکانمدا گەڕاوی؟

- شتێکی لەو بابەتە!

- کەوایە تۆ دزی!

خەندەیەکی ماناداری کرد و گوتی:

- چیی تریش؟

ئانیشکم دانا و چەناگەم خستە ناو لەپی دەستمەوە و گوتم: «یوست! مم، کەمانچە دەژەنی، نوێژێک دەکەی کە من سەری لێ دەرناکەم، حەزت لە سەعدوون جابرە، عێراقییت و بڕوات بە فەلسەفەی نیچە هەیە.»

- چیی تریش؟

- پێغەمبەریشی!

برۆی بەرز کردەوە و گوتی:

- پێغەمبەری گومان؟

- پێغەمبەری عیشق و ئیلهام و یەقین.

- ژنبازێکی تاکت نییە!

پێی وایە ژنبازێکی لێهاتووم، بەڵام نازانی کە خۆی چەندە لە هێنانی بەختەوەری و هیوا و خۆشیدا شارەزایە، بێئاگایە لەوەی کە چەندە وام لێ دەکا هەست بە ژیان بکەم. من ئاسەداری ژیانم و بە

---

١٩٤٠ و ١٩٥٠ بوو و بێ گومان گۆرانییەکانی، لە پڕفرۆشترین گۆرانییەکانی ئەوکات
ت بە جۆرێ کە نزیکەی ١٥٠ ملیۆن دانەیان لێ فرۆشراوە. «و.ک»

هەموو بوونمەوە باوەشم پێیدا کردووە، وەلێ سەرباری قاڵبوونەوەم تێیدا برسی و تینووی هەموو چێژەکانم.

زۆرێک پێیان وایە قووڵبوونەوە لە شتێکدا، وا دەکات کەسەکە لەو شتە وەڕەز بێت، بەڵام من پێم وایە قووڵبوونەوە و تێربوون هیچ پاساوێک نایانگرێتەوە و مەرج نییە هەردووکیان بە یەک ئەنجام بگەن؛ چونکە چەمکی چێژ زۆر لەوە ئاڵۆزترە کە بیری لێ دەکەینەوە.

ئێمە لە ڕێی هێنانەدیی ئەو شتەوەی کە حەزمان لێیە و شەیدایین ناگەین بە چێژ، بەڵکە هەندێک جار چێژ لە بەدەستنەهێناندایە لە هەمان کاتیشدا بەراستگەران و گەیشتن بە شتێک. چێژ و خۆشی خۆی هەیە. چەمکی چێژ هێندە ئاڵۆزە کە سنووری ئاگلیمان تێدەپەڕێنێت.

سەر لە پێویستییەکانم دەر ناکەم، نازانم بۆچی مەیلم بەرەو هەندێک چێژ دەچێت و سەرێشم بۆ هەندێکی تر دەخووڕێت کە تەنیا و تەنیا من عەودالیانم. دواجار من پیاوێکم کە بیرۆکە کتوپڕانەکان، ئارەزووە لەناکاوەکان و ئەو چێژانەی کە ئاگرێت لە گڕنگی و ڕەگوڕیشەکەیان تێبگەیت، جڵەویان گرتووم.

بەڵام سەرباری هەمووی، لە سەرچڵیی بیرکردنەوە و گرژیی هەستەکاندا، بەو ناگەم. هەر ئەوە کە بێ هۆکار شۆڕش بەرپا دەکات هەر ئەویشە کە دوای شۆڕشی تووڕەیی و حاڵەتێکی کتوپڕی شێتۆکەیی، دادەساکێت و لە هۆکارەکەشی تێناگەم.

نازانم، تۆ بڵێیت شتێکی زگماکی بێت کە پیاوان حەز لەو ئافرەتە نامۆیانە دەکەن کە لە خۆیان ناچن، یان ئەوەتا شتێکی تر بەرەو ئەو ئافرەتانەی کە نازانین چییان لە سەردایە و خۆشیان نازانن کە چیان دەوێت، پاڵمان پێوە دەنێت.

پیاوان پێیان وایە زۆر لە ئافرەتان زیرەکترن، کەچی ئەوە هەر پیاوانن کە هەرگیز لە دونیای ئافرەتان تێناگەن. منیش هەرچەند ئالۆزیش بێت، بەڵام لای نێر هەر ئاستی ژیریی نزمترە و، تەنانەت لە جیهانی ئاژەڵەکانیشدا سرووشتی نێرەکان شتێکی وای لە سرووشتی مرۆڤە نێرەکان نەگەڕاوەتەوە.

جارجارە بیر لە جیاوازیی پیاوسالاری و نێریی خۆم دەکەمەوە. پیاوسالاری و نێری، مشتومڕێکە کە لە دونیای ڕۆژهەڵاتدا نابڕێتەوە، بە تایبەت لای ئەو عەرەبانەی کە بە شێوەیەکی وەهمی «پیاوسالاری»یان گەورە کردووە.

لەو ساڵانەدا داواکاریی دامەزراندنی نووسەری نوێم لە ڕۆژنامەدا پێ گەیشت. پێشنیارەکە لە لایەن جیهادەوە بوو، چونکە هەمیشە لە هەڵبژاردنی لاوە بەهرەدارەکاندا متمانەم پێ دەکات. داواکارییەکی خستە بەردەمم کە کۆمەڵێک وتاری لەگەڵ بوو کە دەبوو بیانخوێنمەوە.

لە کاتی خوێندنەوەی نموونەی داواکارییەکیاندا کە نووسەرێک ئامادەی کردبوو، بینیم ئاماژەی ڕاست لەو خانەی ڕەگەزە دراوە کە نێر و مێ لە یەک جیا دەکاتەوە و لەسەری نووسیوە «پیاو»، ئەمەش سەراسیمەی کردم. ئەم وشەیەی کە نەمدەزانی نووسەر لە ڕێیەوە ویستوویەتی چ پەیامێک بگەیەنێت، منی تاساند. ئاخر یانی چی ڕەگەزت «نێر»ە! ئەوی ڕۆژێ، هەوڵم دا شێوەی نووسەرەکە وێنا بکەم، چونکە وێنەی کەسیی خۆی لەگەڵ ژیاننامەکەیدا نەناردبوو، وەک بڵێیت نێرییتییەکەی، لەبری هەموو شتێکی تر بێت.

کە چاوم پێی کەوت، بۆ ئەو پیاوسالارییە دەگەڕام کە بانگەشەی بۆ دەکرد. بیرکردنەوەکانی شتێکی وایان تێدا نەبوو شانازییان پێوە بکات، جەستەشی بەهێز و کەتە نەبوو، لاوێکی لاوازی کۆنەپەرست بوو. هەست دەکەم سەرچاوی نێرسالارییەکەشی هەر ئەم بیرکردنەوە ڕزیوانە بوو.

که له ژووری کتێبخانەکەم چووە دەر، ئەو پارچە کاغەزەم بیر کەوتەوە کە دڵدارەکەم بۆی نووسیبووم. ئەو چەکمەچەیەم کردەوە کە تایبەت بوو بەو نامانەی کە وەختێک لە شوقەکەدا چاومان بە یەک دەکەوت، بۆی جێ دەهێشتم. نووسینی سەر کاغەزەکەم خوێندەوە: ڕوحم بە بەردا کرا و پێش تۆ بەئاگا هاتم. ئەم بەیانییەیان لە ژیاندا پێشت کەوتم، جا پێش ئەوەی چاوانت هەڵبێنی، دەچم و دەست بە ژیان دەکەم. بەیانیت باش ئەی دواهەمین پیاوی بەڕێز!

دواهەمین پیاوی بەڕێز!

کێ پێی وتووە من دواهەمین پیاوی بەڕێزم! من نە دواهەمینم، نە یەکەم، ئەسڵەن هەر لە پیاوە بەڕێزەکان نیم. پیاوێکم نە باکی بە ئێربوونی خۆی هەیە، نە خۆشی پێیەوە هەڵدەکێشێت. کەوایە بۆچی سووره لەسەر ئەوەی بیرم بێنێتەوە؟ پێم ڕادەبوێرێت، یاخود ئەمە جۆرێکە لە پیاهەڵدان، یان دەیەوێت لە ئێرییەتییە بەڕێزانەکەم رابمێنم!

ئەویش وەک من بە تاسەی ژیانەوەیە، ئیتر بۆ دەیەوێت ژیان لە من بستێنێت و منیش لە ژیان؟ بۆچی دەمگۆڕێت و چۆنچۆنی بەم هەموو یەقینەوە دەمخاتە گێژاوی گومانەوە؟

هەموو بەرەبەیانێک کە پێکەوەین، پێش من هەناسەی ژیان هەڵدەمژێت، وەک بڵێیت لەوە بترسێت ژیان لە ڕوحی دوور بکەوێتەوە منیش هەموو ڕۆژ نابەدڵانە بەئاگا دێم، وەک ئەوەی ڕوحی تەنیام لەوە بترسێت کە بگەڕێتەوە جەستەم و تێیدا نیشتەجێ بێتەوە.

هەرچەند سەوداسەری ژیانم، وەلێ شەکەتیشم دەکات.

ژیان مەتەڵە، کۆمەڵێک لێکچوونی جیاوازی دژبەیەکە کەشمان وەک یەک دەیگوزەرێنین. هەر یەکەمان چیرۆکێکی تایبەت بە خۆی هەیە کە لە چیرۆکی ئەوانی تر دەچێت و لە هەمان کاتیشدا لێی جیاوازە. یەک چیرۆک هەموومان کۆ دەکاتەوە، وەلێ بە وردەکاری

جیاوازەوە، وردەکارییە کەم تا زۆر جیاوازەکان وا دەکەن چیرۆکەکانمان جیاواز بن، دواجار ژیانیش وەک نهێنییەک دەمێنێتەوە و هەرگیز پەی پێ نابەین.

من و ئەو، خەونین یان ڕۆمان؟ خەونێکین و فریشتەکان سازیان داوە، یاخود ڕۆمانێک کە ئاگاگی من نووسیویەتی!

جارێکیان لێی پرسیم:

- گەر وای دانێین مرۆڤ نیم، ئایا دەتوانین پێکەوە بەردەوام بین؟

- بێ گومان!

- چۆنچۆنی؟

- هەر بەو جۆرەی کە هەنیبەعل[1] باوەڕی پێی هەبوو، یان ئەوەتا چارەسەرێک دەدۆزینەوە، یان خۆمان چارەسەرێک دروست دەکەین.

خەندەیەکی کرد:

- هانیبال! بڕوات بە خووڕافەی هانیبال هەیە؟

- هەنیبەعل خووڕافە نییە!

- بەس لەبەر ئەوەی قرتاجییەکی[2] ڕۆژهەڵاتییە؟

---

١. هانیبال یاخود هەنیبەعل: ڕابەرێکی سەربازیی قرتاجیی سەر بە خێزانێکی فینیقی بووە داهێنانی زۆری لە بواری سەربازیدا کردووە و تا ئێستەش کەلک لە هەندێک لە نەخشە و فێڵوتەڵەکە و داهێنانەکانی دەبینرێت. هانیبال هەموو هەوڵێکی خۆی خستە گەڕ تاکوو ڕۆما داگیر بکات و ناوی خۆی وەک ئەفسانەیەک لە مێژوودا بهێڵێتەوە. بەشێکی زۆری وڵاتی ئیتالیا داگیر دەکات و نزیکەی ١٥ ساڵ گەماروی ڕۆما دەدات. نۆرمان شوارزکۆفی جەنەراڵی ئەمریکی دەڵێت: لە جەنگی گەردەلوولی بیاباندا، لە هەموو کەس زیاتر سوودم لە تەکنیکەکانی هانیبال وەرگرت. «و. ک»

٢. شارستانییەت و ئیمپراتورییەتێک بووە کە فەرمانڕەوایی ناوچەکانی دەریای ناوینی کردووە. دەستی بەسەر ئەو جێیانەدا گرتووە کە پێشتر فینیقییەکانی لێ

ناتوانێت بمانخاته پێکەنین، خەیاڵە ناماقووڵەکانی عیشقمان بیر دێنەوە و پێدەکەین.

عیشقی ڕاستەقینە ئەوەیە کە سەرباری هەموو شت، زەردەیەک بەسەر لێومانەوە بنەخشێنێت. هەرچەند یادگاریی ئەم عیشقە بەسوێ بێت، هەرچەند خەمین و تاڵ بێت، بە چاوپۆشین لەوەش کە چۆن کۆتایی هاتووە، هەر ئەم خۆشەویستییەیە کە وێڕای برین و قەتماخەبەستنی زامەکانمان، بزە دەخاتە سەر لێومان و وامان لێ دەکا پێبکەنین.

بەڵام زۆر جار ژیان ناچارمان دەکات بژاردە تاڵەکان هەڵبژێرین و بەدەم ئازارەوە بناڵێنین.

لە ژیاندا زوو زوو لەم تەنگژەیەوە دەگلێین. ئەوەیش کە ئەم حاڵەتی «تەنگژە»یە لە ناخماندا جێی دەهێڵێت، بیرای ببڕ لاناچێت و بە چاوپۆشین لەوەی کە چەنێک کاتی بەسەردا ڕۆیشتووە، تا ئەبەد زیندوو و خوێناوی و هەوکردوو دەمێنێتەوە. ئەم حاڵەتانە هێندە زووخاو بە دڵماندا دەکەن کە ڕۆحمان لەتاو ئازار خەریکە شەق ببات.

دانی پێدا دەنێم لە کاتی خەفەتخواردندا لاواز دەبم. هێزم لە بەر دەبڕێت و ماسوولکەکانی دڵم خاو دەبنەوە، زمانم لاڵ دەبێت و بیرکردنەوەکانم سڕ دەبن. زۆر لەمە دەترسم، چونکە تا ڕادەی مردن گەمژەم دەکات.

دایم بیر دەکەمەوە کە ئایا شایەنی ئەو هەموو خەم و پەژارەیەم! بیر دەکەمەوە تۆ بڵێیت خودا لەپای شتێک کە لێی تێناگەم، یان شتانێک کە لێیان تێناگەم، سزام بدات! بەڵام خۆ تێناگەم، کەوایە چۆن بڕیار لەسەر شتێک بدەم کە لێی تێنەگەم!

هەندێک جار هەست دەکەم خودا تەنیا لەپای ڕەفتارەکانم سزام نادات، بەڵکە لەپای بیرکردنەوە و هەست و هەموو ئەو شتانەی کە

خۆشـــم دەوێن و ئەوانەش کە خۆشـــم ناوێن. بەڵام خۆ خودا لەوە دادپەروەرترە. ئەی کەوایە بۆ جاروبار ئەم هەستە سەرم تێ دەکات!

دەڵێن *تـاریکترین کـاتژمێرەکـانی ڕۆژ هەر ئەوانەن کە لە* خۆرهەڵاتنەوە نزیکن، بەڵام کاتژمێرە نووتەکەکانی من بەردەوام تووڵ دەکێشـــن و ئەو گزنگەش کە چاوەڕێیم، هێشـــتاکە زۆر دوورە. نە تاریکییەک ڕەوییەوە و نە پرشـنگێکیش سـەری دەرهێنا و ترسیشم لەوەی کە هەر وا دیلی شەوە نووتەکەکان بم و لە چاوەڕوانی گزنگدا بمێننەوە، برســـتی بڕیوم. هەر وەک گەڕانەوەی ئەو کە کەس تێی ناگات. کە گەڕابووەوە، نامەیەکی لەسـەر قەنەفەی «شـوقەکەمان» بۆ جێ هێشـــتبووم. بە پەنجەگەلێکی تامەزرۆوە کاغەزەکەم ڕاکێشـا و دەســـتخەتە جوانەکەیم بەرچـاو کەوت کە نووســـیبووی ئەحلام موستەغانمی دەڵێ: *ئەو شتانەی کە لامان ئەزیزن دەیاننووسینەوە، نەک ئەوەی بیانڵێین*، چونکە *نووســـین دانپێدانانێکی بێدەنگە.* منیش *دانی پێدا دەنێم کە زۆر بیرم کردی، یەک دەبینین!*

یەک دەبینین! یـانی چی یەک دەبینین، کەی یەک دەبینین؟! وا دەزانێت تا سـەر من لەم چاوشارکێی سۆسـەکردنە بەردەوام دەبم و پشوودرێژیم کۆتایی نایەت؟

چێژ لەوە دەبینێت پەیوەندییەکەمان هەر وا تەمومژاوی بمێنێتەوە؟ وەک ئافرەتانی تر سـڵ لە شـــاراوەیی ناکاتەوە؟ یانی هەر بەوەندە قایلە؟

لە مـاوەی دوو دەیەی ڕابردوودا، هەمیشـــە هەســـتم دەکرد هـاوســـەرگری جۆرێکە لە جۆرەکـانی کۆیلایەتی، وەک حـاڵەتێکی نەگبەتیی خۆخوازانە، بارێکی مـازۆخیانە، بگرە تـا ســـەرئێســـقان مازۆخیانە لێم دەڕوانی.

سەیرە، لەوەتەی نیشتیمانم جێ هێشتووە بیرم لە هاوسەرگری نەکردووەتەوە، وێڕای ناسینی سەدان کچ، هەرگیز ڕۆژێک لە ڕۆژان کەڵکەڵەی هاوسەرگری لەگەڵ یەکێکیاندا، لە سەری نەدام، بەڵام دڵدارەکەم هەموو سۆسەکانمی لنگاوقووچ کردنەوە و سەرلەبەری ئارەزووەکانی گۆڕیم. ئەوەتا ئارەزووی خانەیەکی «ڕاستەقینە» دەکەم کە هەردووکمان کۆ بکاتەوە، دەرگەیەک کە لە کاتی گەڕانەوەمدا بۆم بکرێتەوە. دەمەوێت بەیانیان کە تەختەخەوەکەم جێ دەهێڵم، ببینم ئەو خەوتووە و دڵنیا بم کە لە کاتی گەڕانەوەمدا لەوێ دەیبینمەوە و دەستبەردارم نابێت، یان بڕوا.

بەس عیشق پاڵ بە ئێمەی «مرۆڤدۆست»ـەوە دەنێت کە دەستبەرداری هەموو شتێک ببین. بەڵێ لەپێناو ئەو کەسە، یاخود ئەو شتەدا کە خۆشمان دەوێت، واز لە داروبەرد بهێنین. کە نیشتیمانم جێ هێشت، خێزانەکەشم جێ هیشت و بێ هیچ پەشیمانی و ئاوڕدانەوەیەک هەموو داوێکی وابەستەییم بەوانەوە پچڕاند. بۆیە ئەم کارەم کرد، چونکە چیتر نە خۆشم لە خۆم دەهات، نە لەوانەش کە خۆشم دەویستن. کچێکم خۆش ویست و نەمتوانی بەدەستی بهێنم، ئیدی نە شتێک مایەوە خەفەتی بۆ بخۆم، نە شتێکیش کە بکرێت لە دەستی بدەم، بەڵام بیر دەکەمەوە کە ئەی ئەگەر کاتی ڕۆیشتنم دایکم لە ژیاندا بووایە، داخۆ دەمویرا بڕۆم؟ ئایا وەک هەموو ئەوانەی کە لە خوێنی من بوون، ئەویشم جێ دەهێشت؟

من مرۆڤێک بووم کە باوکم وێڕای هەموو بەدکاری و خەوشەکانی، هەر خۆشم دەویست، بەڵام ئەو پەیوەندییەی کە کوڕ بە باوکەوە دەبەستێتەوە، وەک ئەوە نییە کە کوڕ بە دایکەوە دەبەستێتەوە! هەمیشە دایک گەورەترین خاڵی لاوازی ژیانی پیاوە، با چەندان دەیەش بێ ئەو کەسە ڕۆیشتبێت، وەلێ یادگاریی دایک هەمیشە بەئازارە! جا چ ئازارێکیش!



Scanned with CamScanner

ئێستە نازانم باوکم لە ژیاندا ماوە یان نا! بەڵام ئەو نامانەی کە لە کۆتایی ستوونی هەفتەی ڕۆژنامەدا بۆ ئیمەیلە لاوەکییەکەم دێن، پێم دەڵێن کە هێشتا زیندووە. جنێو، نەفرەت، تۆمەت و گشت ئەو هەڕەشانەی کە لەلایەن کەسە نزیک و هاونیشتیمانەکانمەوە پێم دەگەن، هەموویان ئاماژە بەوە دەدەن کە هێشتا باوکم زیندووە. ئاخر گەر بمردبا، ئەوا لە ڕێی نامەیەکی پڕ لە ڕق و کینەوە، ئاگادار دەکرامەوە.

بیر دەکەمەوە باوکم دوای دوو دەیە لە دووریی منیش، هەر پیاوێکی توند و کەللەڕەقە و ئامادەیە لەپێناو ڕاگرتنی دڵی کۆمەڵدا، نزیکترین کەسی خۆی بکاتە قوربانی. بەڵام هەندێک جار بیر دەکەمەوە، سەرزەنشتی کێ بکەم؟ ئەو، یان خۆم؟ ئەو بوو وازی لە کوڕە لاوەکەی خۆی هێنا کە هەموو ئاواتی ئەوە بوو هاوسەرگری لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا بکات، یان ئەوە من بووم کە شەقێکم لە هەموو ئەو شتانە هەڵدا کە بەوەوە دەیانبەستمەوە و بەمەش ناچارم کرد دەستم لێ بشواتەوە؟

دوای ڕۆیشتنم، هەرگیز ڕۆژێک لە ڕۆژان باوکم دەستی گەڕانەوەی بۆ درێژ نەکردم، بەڵکە بە پێچەوانەوە، براکانم لێی دانیشتن و لە ماوەی هەموو ئەو ساڵانەدا تەنیا ئیشیان ئەوە بوو نەفرەت و جنێوەکانی باوکم لە ڕێی کۆمەڵێک ئیمەیڵەوە کە لێوڕێژ بوون لە کینە و ڕق و شەرم لەوەی سەر بەوانم، بۆ من بنێرن. هەر ئەمەش وای کرد هێندەی تر خۆم دوور بگرم، یاخی ببم و ئەوەندی تریش دەستبەرداریان بم.

لە کۆمەڵگەیەکی وادا، گەورەترین تاوان بەرانبەر خێزان و خێڵەکەت، ئەوەیە کە لە پرسێکدا لێیان جیاواز بیت. خۆشەویستیی منیش بۆ لەیلا لادان بوو و بڕیاری هاوسەرگرییەکەشم گوناحێکی

گەورە. ئەوە با هەر باسی نووسین نەکەین کە کوفرێکە کەس لێمی قبووڵ ناکات.

لە کۆمەڵگەیەکی هاوشێوەی ئەوەی کە لێی دەژیام، گەر بتەوێ بە ئازادانە بنووسیت، خۆت تووشی تەکفیرکردن و هەڕەشە و لێپرسینەوەی فەرمی و نافەرمی دەکەیت، هاوکات خۆشت دەخەیتە مەترسییەوە! نووسین واتە سەرکێشیکردن بە ژیان و سەلامەتی و سەقامگیری و سامان و منداڵەوە. منیش سەرکێشیم بە هەموویەوە کرد، چونکە ئازاد بووم و خاوەنی شتێک نەبووم کە ڕۆژێک ترسی لەدەستدانیم هەبێت.

وا بزانم نیشتیمانم جێ هێشت تا سزای خێزانەکەم بدەم، پێم وا بوو دووریی من کاریگیان پێ دەکات لە پەشیمانیدا بمرن، بەڵام ڕۆیشتنم وای کرد زیاتر ڕەد بکرێمەوە، ڕۆیشتنەکەم منی کردە سەردەستەی گومڕاکان! ئەوان جگە لە پاریزگاریکردن لە دابونەریتەکانی خێزان، شتێکی تریان نەکرد! ئەو کارە بە هەڵە و تاوانێکی مرۆڤانە نازانن کە بەرانبەریان کردم. لەپێناو بەرژەوەندیی خێزاندا خۆیان لێم بەری کرد و، ئەمەش بۆ پاساودانی کارەکەیان بەسە، تەنانەت گەر باجەکەشی بە خۆشبەختی و چارەنووس و بەرژەوەندیی من بدرێت.

ئێستە چەندە ڕقم لەو خێزانەیە، هێندەش بەتاسەی پێکەوەنانی دانەیەکم. وا بزانم هەرگیز پێشتر بیرم لە هاوسەرگری نەکردبووەوە، چونکە نەمدەویست خێزانێک پێک بهێنم و ستەم لە ئەندامێکیان بکەم، جا ئەم ستەمە بە ئەنقەست بێت یان نا.

هەرگیز نەمزانی کە چۆنچۆنی پیاوان هاوسەرگری دەکەن، چۆن دەوێرن منداڵگەلێک بخەنەوە و دەست وەربدەنە چارەنووسیان (هەڵبەت گەر جڵەوی نەگرن). نازانم چۆن وەک غەریزەیەکی مرۆڤانە لەم هەموو وێرانکارییە دەڕوانن. هەرچەند پێشتر بڕیارم دابوو

هاوســەرگری لەگەڵ لەیلادا بکەم، بەڵام ئەو بڕیارەم هەرگیز ئاقڵانە نەبوو، بەڵکە بڕیارێکی سـۆزدارانە بوو کە تەنیا بە کۆمەڵێک هەستی هەرزانە و ئارەزووی گڕگرتوو پشتئەستوور بوو.

ئێستە دەزانم کە گەر بگەڕێمەوە ئەو سـەردەمە، هاوسـەرگری لەگەڵ لەیلا ناکەم، چونکە بڕیاری هاوســەرگرییەکەم کاڵفامانە و خۆشەویستییەکەشم ناشیانە بوو، لەبەر ئەوەی یەکەم ئەزموونم بوو؛ ئەزموونێک کە بە سەرچڵی دەستی پێ کرد و بە قوربەسەری کۆتایی هات، بەڵام ئەمە بە هیچ جۆرێک پاســاوی ئەو کار و قوربانییە گەورەیە نادات کە خێزانەکەم بە منیان دا.

ڕۆژێکیان خوێندمەوە *زوهەیرەدین بابری*[1] *ئیمپڕاتۆر* کە کوڕەکەی نەخۆشییەکی کوشندە دەگرێت، لە خودا دەپاڕێتەوە ئەو بەڵایە لەسەر کوڕەکەی لا ببات و بیخاتە سـەر خۆی. لە خودا دەلاڵێتەوە کوڕەکەی ڕزگار بکات و خوداش بەدەم نزای پاشا مەزنەکەی مەغۆلەوە دەچێت. کوڕەکەی بە تەواوی باش دەبێتەوە و باوکەکە نەخۆش دەکەوێت. کاتێکیش دکتۆرەکان لە سـەرتاسـەری ئیمپڕاتۆرییەتە بەرفراوانەکەوە دێن تاکوو چارەسـەری بکەن، بابر ناهێڵێت هیچ کەس چارەی بکات و بڕیار دەدا کوڕەکەی کە داوای لە خودا کردبوو تیماری بکات، نەجات بدات و بێ هیچ ملەجیڕەیەک خۆی بە دەستی مەرگەوە دەدات.

ئەوی ڕۆژێ بیرم لەوە دەکردەوە کە باوکی من و ئەم ئیمپڕاتۆرە، بارتەقای ئاسـمان و زەمین جیاوازییان هەیە. باوکم هەرگیز مرۆڤێکی

---

١. زوهەیرەدین بابر (١٤٨٣-١٥٣٠): جێگرەوەی عومەر شـێخ میرزا و دامەزرێنی دەســەڵاتی مەغۆلی هیندی بووە. لە پاڵ ئەمەدا کۆمەڵەی فەرمانڕەوایانی مەغۆلی هیندی پێک هێناوە کە نزیکەی ٣٠٠ ســاڵ فەرمانڕەوایی نیمچەکیشـوەری هیندییان کردووە تا ســاڵی ١٨٥٧ موحەممەد بەهادوور شــا کە دواهەمین دەســەڵاتداری مەغۆلەکان بوو، لە لایەن بەریتانییەکانەوە تێک دەشــکێنرێت و ئەمانیش کۆتایی بە دەسەڵاتەکەیان دێت. «و. ک»

مەزن نەبووە، پیاوێکی ئاسایی بووە و بڕوای بە دابونەریت هەبووە، توند باوەشی بە نەریتەکاندا کردووە و کۆمەڵگەی پەرستووە. ئەلەو ساتەدا کە دەکرا لە بەرچاومدا مەزنیی خۆی بنوێنێت و لەبەر خاتری من بە ڕووی هەمووآندا بوەستێتەوە، شەقێکی لە باوکایەتیی خۆی هەڵدا و چووەوە گەلی خێڵ و دەست لەناو دەستی ئەوان بە ڕووی مندا وەستایەوە تا بەختەوەریم لێ بستێنێت.

بە درێژایی سالانی ڕابردوو، بیرم لەمە نەکردبووەوە، زۆر بەدوای ئەوەدا نەچووبووم کە چی لەنێوان من و باوکمدا ڕووی دا، زۆر سەری خۆمم بەوەوە نەئێشاند کە چیم لە دوای خۆمەوە جێ هێشتووە. وام دەزانی هەموویم تێپەڕاندووە، بەلام دەرکەوتنی دڵدارەکەم، سەری ڕابردوو و ئێستەیەکی بەسوێ و شتێک لە تەلیسمەکانی داهاتووشی هەڵدایەوە. ڕووتوقووت خۆمم لە بەردەم ئەم شەپۆلی ئێش و ئازارەدا بینییەوە و بۆم دەر کەوت لەو ڕابردووەوە گلاوم کە پێم وا بوو ڕزگارم بووە لێی و بە جێهێشتنی، توانیومە لێی هەڵبێم.

*ڤیکتۆر هۆگۆ دەڵێ: نیوەی تەمەنمان لە چاوەڕوانیی ئەوانەدا بەسەر دەبەین کە دەکرێت خۆشمان بوێن و نیوەکەی تریشی لە ماڵئاواییکردنی ئەوانەی کە خۆشمان ویستن.* منیش نیوەی تەمەنم چاوەڕوانیم کرد، بەس پێم وا نییە بتوانم نیوەکەی تری لە ماڵئاواییکردنیدا بەسەر بەرم.

قەت بیرم لەوە نەدەکردەوە عیشق بەم جۆرە بەرۆکم بگرێت، ئەبەم شێوەیە سەر هەڵبدات، هێندە خێرا جێی خۆی بکاتەوە و بەم ئالۆزی، دوودڵی، چاوەڕوانی و بێدەنگییەوە ڕەگ دابکوتێت، وەلێ ئاخری بەم جۆرە سەری دەرهێنا و ئەزموونی دووروودرێژی ژیان، سالانی بێهوودە، مێژووی خەمەکانم و هەڵسەنگاندنی هەموو جۆرە مرۆڤێک و چەندان ئافرەت، وام لێ دەکەن بێ سێ و دووکردن بڕوا

بکەم کە ئەمە خۆشەویستیی ڕاستەقینەی ژیانمە و گەر بیدۆڕێنم، ئەوا خۆشەویستیی ژیانیشم دەدۆڕێنم.

کە نامەکەیم خوێندەوە، هەستم کرد لەنێوان شادی و خەمدا، لەنێوان نائومێدی و ئومێددا تیا ماوم، هەستم کرد نە دەتوانم هەستەکانم دیاری بکەم، نە بیرکردنەوەکانم ڕێک بخەم، بیر و هەستەکانم بەسەر یەکدا دراون، نە خاڵێکی ڕاگر هەیە خۆمی پێوە بگرم، نە خاڵێکی جێگیر کە تێیدا بسرەوم، بەڵام خۆم بە هیوای مانەوەدا هەڵواسی، لە شوقەکەدا ئۆقرەم گرت و چاوەڕوانیم کرد بباریێ... تا دەر کەوت!

ئێوارەی ئەو ڕۆژە هات. کلیلەکەی با دا و هاتە ژووری، منیش هەر وا لەسەر قەنەفەکە دانیشتبووم و چاوەڕێ بووم. بە چاوانێکی درەوشاوە و دڕ و خرۆشاوەوە لێی ڕوانیم، بەڵام من سەرباری گڕی تاسەم، هەڵنەستامەوە پێشوازیی لێ بکەم و هەر وا بە بێدەنگی کەسێکی گلەییکەری تووڕەوە کە دەیەوێت تۆڵە بکاتەوە، تەماشام کرد. لێم نزیک بووەوە و لە بەردەممدا دانیشت، دیوانەکەی مەحموود دەرویشی لە دەستمدا دەرهێنا و بە دەستییەوە گرت. سەری پەنجەی شایەتمانی بە چەناگەمدا دەهێنا و بە دەنگێک کە دەتگوت دەنگی بەسامی هاتنەخوارەوەی سرووشە، گوتی: «دەزانی ئەم بێدەنگییەت کێم بیر دێنێتەوە!»

بە تامەزرۆیی کەسێکی خۆبەزلزانەوە لە سیمای ورد دەبوومەوە و هیچم نەوت.

بە مەکر و نازەوە بەردەوامیی دایە قسەکانی: «جۆرج ئێلیەت دەڵێ، *سۆزی خامۆش، جگە نیشانەیەک لە نیشانەکانی خەفەت هیچی تر نییە.*»

– پێت وایە سۆزم خامۆش بووە؟

- بەڵکە هەست بە ئاگری سۆزت دەکەم، بە ڕادەیەک کە وێڕای خەمەکانت، خەریکە بڵێسەکەی لرفم دەدا!

- بۆ تاهەتایە دەمەوێی!

- هیچ کاممان بڕوامان بە ئەبەدییەت نییە، ئیتر بۆچی پێت وایە کە ئارەزووەکانت نەمر دەبن؟

هەستامەوە و ئامێری ئامادەکردنی قاوەکەم داگیرساند. چەند کلۆ شەکرێکم خستە کوپەکەوە و ساردوسڕانە پێم گوت:

- بەهەرحاڵ! جۆرج ئیلیەت ژنە نەک پیاو!

بە تووڕەییەوە گوتی:

- جا چییە!

بێ ئەوەی ئاوڕ بدەمەوە گوتم:

- چییە کە لێم دوور دەکەوییەوە شێت دەبی؟

- تۆش کە لات نەبووم، بێباک بووی؟

کوپە قاوەکەم هەڵگرت و لەسەر قەنەفەیەکی دوور لەوەوە دانیشتم. جا گوتم:

- بێزار بووم! لەم هاتن و نەهاتنە بێوادەیەت بێزار بووم! بێزار بووم لەوەی کە بە ئارەزووی خۆت دەگەڕێیتەوە، لەوەی کتوپڕ ون دەبی و دەر دەکەوییەوە.

- کەمێ پێش ئێستە وتت کە بۆ ئەبەد منت دەوێ! ئێستەش دەڵێی بێزار بووی!

- لەم یارییە بێزارم، لەوەی کە چاودێریت بکەم و نەزانم کێی و کێ نییت.

– حەز دەکەی سەرکێشیم پێوە بکەی؟

– بەڵکە حەز دەکەم لەگەڵتدا سەرکێشی بکەم.

قوتووی جگەرەکانی دەر هێنا، دانەیەکی پێ کرد و بێ ئەوەی ئاوڕم بۆ بداتەوە، بە تووڕەییەکەوە کەوتە مژلێدان.

بە جددیەتێکەوە پێم گوت:

– من هوزامم!

بە سەرسووڕمانەوە ئاوڕی دایەوە و گوتی:

– چی؟

منیش لێم پاتە کردەوە:

– هوزام! ناوم هوزامە.

– خۆ من لە دونیایەکی تردا نیم تا نەزانم تۆ کێی!

– لە کەیەوە دەمناسی؟

– لە یەکەمین بەرکەوتنمانەوە.

بە گاڵتەوە پێم گوت:

– کەوایە منت ناسی و ویستت بزانی چیم!

– بەڵکە دەمویست بزانم بەشوێن چییەوەی!

– ئەی تۆ پێم ناڵێی چییت و بەشوێن چییەوەی؟

کەمێ ڕووی وەرگێڕا و بە دەنگی نزم گوتی:

– من ولادەم!

خاو خاوێک پیتەکانم وتنەوە و دەمویست ناوەکەی بزانم:

– ولادە!

بە شەرمێکی دڵبەرانەوە گوتی:

– بۆ وات دەزانی ناوم چییە؟

– لە ئەڤینی ولادە بترسە، سەرابێکە و بۆت دەرکەوتووە، برووسکەیەکە و چەخماخە دەدا!

بزەیەک کە نەدەکرا بیشارێتەوە، بەسەر لێوییەوە گیرسایەوە:

– مەرج نییە کە من ولادە بم، ئیتر تۆیش ئیبن زەیدوون[1] بی!

پڕبەدڵ پێکەنیم و گوتم:

– نا من کوڕی عوسامم و خەڵکی دێیەکی ڕیازم.

دووەم جگەرەی داگیرساند و گوتی:

– من خەڵکی لادێیەکی عەمارەی عێراقم.

خەندەیەکم کرد و وەڵامم نەدایەوە. جا بەردەوامیی بە قسەکانی دا:

– پێم وا نییە سەرسام بی بەوەی کە خەڵکی عێراقم!

– ئەم عەمارەیە دەکەوێتە کوێوە؟

– نزیکی ئەحوازە.

– تۆ شیعییت؟

– سابئیم!

---

1. ئیبن زەیدوون (١٠٠٣-١٠٧١): ئەبو وەلید بن ئەحمەد بن زەیدوون، نووسەر و شاعیرێکی ئەندەلووسی بووە. زیاتر بەهۆی عیشقەکەیەوە بۆ ولادەی کچی موستەکفی ناوبانگی دەرکردووە کە شازادەی ئەندەلووس و شاعیرێکی عەرەب بووە لە سەردەمی ئومەوییەکاندا. «و. ک»

بە سەرسامییەوە پرسیم:

– سابئی!

گاڵتەئامێز و لە هەمان کاتیشدا بە هەیبەتەوە گوتی:

– دڵنیام کە پێشتر چاوت بە کچ یاخود کوڕێکی سابئی نەکەوتووە!

– ڕاستییەکەی بڕوام نەدەکرد قەت چاوم بە یەکێک بکەوێ! چونکە پێم وا بوو تاکوتەرا ماون!

– منیش بە هەمان شـێوە، پێم وا نییە بتوانم یەکێک بدۆزمەوە، بە تایبەت لێرە.

– چۆن هاتییە ئێرە؟

– تۆ چۆن هاتی منیش ئاوا.

– من ڕام کرد، لە دەست خێزانەکەم.

– منیش لە دەســت نیشــتیمان ڕام کرد و لێرە بوومە پەنابەر، وا دیارە هەردووکمان نە خێزانمان هەیە و نە نیشتیمان.

– کەوایە هەردووکمان ڕاکردووین.

– ڕاســتییەکەی ئێمە دەرکراوین هوزام، ڕامان نەکردووە. کەسانی وەک ئێمە هەڵنایەن، بەڵکە دەر دەپەڕێنرێن.

خەندەیەک بەسەر لێومەوە بوو و لێی ورد دەبوومەوە. ناوەکەم بە دەنگی ئەو زۆر خۆش دەهاتە گوێ، هەســـتم دەکرد یەکەم جارە لە ژیانمدا گوێم لە ناوی خۆم بێت. نەمدەزانی ناوەکان هەســـت و ســـۆزێکی وامان دەدەنێ کە چێژیش پێی ناگات! هەســـتم بە عیشق دەکرد کە دەڕژێتە هەناومەوە و ئەو مەودایەی کە ئێمەی لە یەک جیا دەکردەوە، تا دەهات بەرتەسک و بەرتەسکتر دەبووەوە، تا ئەوەی کە نامێنێت.

لێی پرسیم:

- بۆچی بێدەنگ بووی؟

- هەست دەکەم عاشقت دەبم!

- لەوە ناترسی کە وەک تۆ نیم؟

- ئەی عومەری بن ڕەبیعە نالێ کە دژێک جوانیی دژەکەی تری دەر دەخا!

- هیچ جوانییەک لە جیاوازیی ئاییندا نییە!

لێم پرسی:

- بڕوات بە ئایینەکەت هەیە؟

- ئەوە ئایینە کە من لەوانی تر جیا دەکاتەوە، کەوایە هەمیشە شتێک هەیە کە بە ئایینەکەممەوە ببەستێتەوە. هەرچەند خۆشم ناوێ، بەڵام ڕێزپەڕم دەکا.

- کەوایە فێرم کە.

- جا بۆ دەتەوێ فێر بی؟

- چونکە لای تۆ گرنگە!

خەندەیەکی کرد و گوتی:

- بەڵام ناتوانم فێرت کەم، چونکە ئایینی سابئی بەس بۆ سابئییەکانە.

سەرەکییەکان!

- بەڵام شتە سەرەکییەکانیم پێ بڵێ ئافرەت، سەرەکییەکان!

- لە ڕۆژێکدا سێ جار نوێژ دەکەین. نوێژەکەمان لە هی موسڵمانانەوە نزیکە، بەس کڕنووش نابەین و لە کاتی نوێژدا ڕوو دەکەینە باکوور و هەندێک ئایەتی کتێبە پیرۆزەکەمان دەخوێنین.

هەموو ساڵێک سیوسێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبین، بەڵام خۆمان لە هەموو شتێک ناگرینەوە! بیروباوەڕمان وەک هی موسڵمانانە، زینا و کحوول و درۆ و ستەم حەرامە و بڕوامان بە قەزاوقەدەر و زیندووبوونەوە و بەهەشت و دۆزەخ هەیە.

– لەنێو خۆتاندا بە مەندائی قسە دەکەن؟

– لە ماڵی خۆماندا بە مەندائی قسەمان دەکرد تا بیرمان نەچێتەوە، چونکە باوکم باوەڕدار بوو.

– باوەڕدار!

– شێخێکە لە شێخەکانی سابئە.

بە گاڵتەوە لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:

– بەڵام لەو کاتەوەی عەمارەم جێ هێشتووە، کەسم نەدیوە بە مەندائی قسان بکا، ڕەنگە هی ئەوە بێ کە ئەسڵەن چاوم بە سابئییەک نەکەوتووە.

– کتێبەکەتان بە مەندائی دەخوێنییەوە؟

– *کەنزا ڕەببام*[1] لا نییە و قەتیش نەمخوێندووەتەوە، بەڵام بەشی نوێژم لێ لەبەر کردووە. باوکم فێری کردم و نوێژیش بە مەندائی دەخوێنم.

– کەوایە فێرم کە! با ببێتە زمانی هەردووکمان.

هەستایەوە و لە باڵکۆنی شوقەکەدا وەستا، بێ ئەوەی لا بکاتەوە گوتی:

---

١. کەنزا ڕەببا Ginza Rabba: بە زمانی ئارامی واتە گەنجینە مەزنەکە. کتێبی پیرۆزی شوێنکەتووانی ئایینی سابئی مەندائییە. لە ٦٢ سوورەت پێک دێت کە لە نزیکەی ٦٠٠ پەڕەدا کۆ کراونەتەوە. «و. ک»

- با واز لە هەمووی بێنین، خۆ گوتم کە ئایینی سـابئی تەنیا بۆ سابئییەکانە و لام وا نییە جگە لە خۆیان پێویست بکا کەسی تر بە مەندائی قسە بکا، کەوایە هەر بیریشی لێ مەکەرەوە.

لێی نزیک بوومەوە و گوتم:

- رەنگە منیش پێویستیم بەو باوەڕەت بێ، پێویستیم بە باوەڕێکە تا کۆمان بکاتەوە.

- جا کێ وتوویەتی من باوەڕدارم!

- چاوم لێ بووە نوێژت کردووە!

- من لەبەر ئەوە نوێژ ناکەم کە باوەڕدارم، بەڵکە نوێژ دەکەم تا پەنایەکم هەبێ.

- یانی چۆن؟

- پێویستم بە پەنایەکە هوزام! شـتێک کە بە هەڵە و گوناح و ملەچییەکانمەوە بگەڕێمەوە بۆی! با ڕقیشم لە ڕەگەزپەرستیی ئایین بێ، بەلام حەز ناکەم ئافرەتێکی هەڵکەنراو بم.

- بەلام بە چاوپۆشین لە رابردووت، هەر شتێکت لە باوەڕ و خوداترسی تێدایە!

- هەر لە یەکەم بەرکەوتنمانەوە پێم نەگوتی کە قەسیدەکان دەقی پیرۆزن و کەس بۆی نییە دەسکاری و مامەڵەیان پێوە بکا!

- لێم خۆش دەبێ، دڵنیای کە لێم خۆش دەبێ!

- گەر دەزانی چەندە ڕقم لە ئایینەکانە هوزام، چەندە بێز لە جیاوازییەکانیان دەکەمەوە! ئایینەکان وامان لێ دەکەن لە یەک نەچین، هەر ئایینیشە کە لە نیشتیمان تارمان دەنێ و نایەڵێ ئارەزوومەندانە ئەو کەسە هەڵبژێرین کە خۆشمان دەوێ.

– لەبەر ئەمە عێراقت جێ هێشت؟

– من جێم نەهێشت، دەر کرام! دەمارگیری منی دەر کرد و خۆشەویستییەکەشمی لە گۆڕ نا، ئیدی نەمدەتوانی بێ خۆشەویستی، بە ڕووی ئەم دەرکرانەدا بوەستمەوە.

گوێم لە ولادە دەگرت و هەستم دەکرد غیرە دزە دەکاتە ناخمەوە، نازانم بۆ غیرەم لە قسەکانی کرد کە سەبارەت بە ڕابردوویەکی دزێو بوون! چاک دەزانم کە ئافرەتێک لەو تەمەنەدا، هێندە جوان و جیاواز و تایبەت، ئەم هەموو ساڵە هەر وا تەنیا نەدەمایەوە بێ ئەوەی عاشق ببێت و کەسیش عاشقی ببێت، بەڵام ئەم قسەکردنە ماتەمبارەی لەبارەی عیشقێکی لەمێژینەوە، شتێکی لە ناخمدا وروژاند، هەستم کرد تووڕەییم خەریکە بێتە کوڵ. منێک کە هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان دڵپیسی نزیکم نەکەوتبووەوە!

گوتی:

– بیر لە چی دەکەیتەوە؟

– نازانم!

– گەر دەتزانی ڕووخسارت چۆن بەسەر یەکدا دەترشێ کە درۆ دەکەی.

پشتگوێم خست و گەڕامەوە بۆ سەر قەنەفەکەم. لە دوورەوە لێی ڕامام و بیرم لە لەیەکچوونمان دەکردەوە. ئەو ئایین تاری ناوە و منیش دابونەریت، بیرم لەو خۆشەویستییە دەکردەوە کە لەپێناویدا وازمان لە هەموو شت هێنا تا لە سووچێکی ساردی غەریبیدا خۆمان پەنا بدەین.

لێم پرسی:

– پێت وایە عیشقەکەت دانسقە بووبێ؟!

بە گاڵتەوە وەڵامی دامەوە:

- وا دەزانی گەر دانسقە نەبووایە، ئێستە لێرە دەبووم؟

کەمێک بێدەنگ بووم، جا گوتم:

- چیی تریش؟ دەی، چیت لە دڵدایە بیڵێ!

پێکەنی و پێکەنی و پێکەنی، هێندە پێکەنی کە بیرم کردەوە ڕەنگە پێشتر قەت پێنەکەنیبێ! لە ناخی دڵەوە لە قاقای دەدا، بە ڕادەیەک کە وێڕای ئەو ئاگرەی لە ناخمدا لرفەی دەهات، منیشی خستە پێکەنین.

بەدەم پێکەنینەوە لێی پرسیم:

- ئەوە چیتە کوڕە! دڵت لێم پیسە؟!

بە لووتبەرزییەوە گوتم:

- نازانم.

- گوێکانت سوور بوونەتەوە.

- بە ڕاست!

جا گوتی:

- خۆشەویستییەکەی ئەوکات بەتین بوو، بەڵام خۆ هەر ڕابردووە. هاوڕای ئەنیس مەنسوورم[1] کە دەڵێ ڕابردوو جوانە، چونکە تێپەڕیوە، خۆ گەر بگەڕێتەوە خۆشم ناوێ!

---

١. ئەنیس مەنسوور (١٩٢٤-٢٠١١): نووسەر، ڕۆژنامەنووس، ئەدیب و فەیلەسووفێکی میسرییە. زیاتر بە شێوازە تایبەتەکەی ناوبانگی دەر کرد کە شێوازی فەلسەفی و ئەدەبیی لە بەرهەمێکدا تێکەڵ دەکرد. ئەنیس لە قوتابخانەی ناوەندیدا یەکەمی هەموو میسر بووە و دواتریش دەچێتە کۆلێژی ئادابی زانکۆی قاهیرە و لەوێ بەشی فەلسەفە تەواو دەکات. چەند زمانێکی زانیوە، لەوانە: ئینگلیزی، لاتینی، ئیتالی، فەڕەنسی، ڕووسی و ئەڵمانی. ئەم شارەزاییەی لە زماندا، وای کردووە

– موسڵمان بوو؟

– موسڵمانێکی شیعەمەزهەب بوو، لە زانکۆ پێکەوە بووین.

– کەوایە هیچ ئەگەرێکی هاوسەرگری لە ئارادا نەبوو!

– هاوســـەرگریی ئێمە نەکردە بوو، چونکە هاوســـەرگریکردنی سابئییەک لەگەڵ کەسێکی ناسابئیدا، وەک خۆکوژی وایە، جا چ بگا بەوەی باوکت باوەڕدار بێ! باوکی من تا سەرئێسقان لە بیروباوەڕی ئایینی خۆیدا دەمارگیر بوو، هەموو بەیانییەک بەئاگا دەهات و دەچووە ڕووبار تا *ڕەشامە* بگرێت. هەموو ڕۆژ چاوی لەسەرمان بوو تا سێ جار *بەراخە* بکەین. هەرچەند ئەو ســـەردەمە زۆربەی هەرە زۆری ســـابئییەکان مەندائییان نەدەزانی، بەڵام باوکم ســـوور بوو لەسەر ئەوەی فێرمان بکا.

– تۆ بوەستە! حاڵی بووم کە بەراخە نوێژە، بەس ڕەشامە چییە؟

خەندەیەکی کرد و گوتی:

– دەستنوێژ. هەرچەند سەرمەشقەکانمان ڕێگەیان دابوو بە ئاوی ئاساییش کە خوڕ نەبێ، دەستنوێژ هەڵگرین، بەڵام باوکم لە ڕووباردا دەستنوێژی دەگرت.

بەردەوامیی بە قســـەکانی دا: «دەزانی زۆربەی ســـابئییەکان دێنە مەراسیمەکان و نوێژ دەکەن بێ ئەوەی وشـــەیەک لەوە تێبگەن کە دەیخوێنن! هەمیشە بیرم دەکردەوە کە چۆن دەکرێ بڕوامان بە شتێک بێ کە تێی نەگەین و خوو بە شـــتێکەوە بگرین کە هیچ لە ناخماندا ناجووڵێنێ. کاتی بەشـــداریکردنم لە مەراســـیمەکاندا، هەســـتم بە جۆشـــوخرۆش دەکرد، چونکە لەوە تێدەگەیشـــتم کە دەخوێنرا، بەڵام

---

شـــارەزای کولتووری گەلانی جیهان ببێت. جیا لەمە، بەشـــێکی زۆری بەرهەمەکانی کراونەتە فیلم و زنجیرەی تەلەفزیۆنی. «و. ک»

بەشێکی زۆری سابئییەکان هەر تەقەی سەریان دەهات، کەچی هەر سوور بوون لەسەر ئەوەی بێن و سرووتەکانی بە ملکەچی و خۆشەویستییەوە ئەنجام بدەن.

– کەی عێراقت جێ هێشت؟

بەدەم کوژاندنەوەی جگەرەکەیەوە گوتی:

– بەفرانباری ١٩٨٨، دوای دامرکانەوەی یەکەم جەنگی کەنداو.

– ئەوکات تەمەنت چەند بوو؟

بزەیەکی کرد و گوتی:

– ئەم هەموو پرسیارەت کرد تا بزانی تەمەنم چەندە؟ هەژدە ساڵ بووم...

– ئێستە دەبێ چل ساڵێک بی!

– چەند مانگێکم ماوە ببمە چل.

– دەزانی منیش لە بەفرانباردا نیشتیمانەکەمم جێ هێشت.

– هەمیشە بڕوام وا بووە کە بەفرانبار مانگی کۆتاییەکانە.

لەسەر قەنەفەکەی بەرانبەرم دانیشت و درێژەی دایە قسەکانی:

– سەرەتا نەهاتمە ئێرە، بەڵکە چوومە بەیرووت کە ئەوکات بیرتەسکی ئەوێشی کردبووە دۆزەخ. چەند مانگێک لە زانکۆی قەدیس یوسف خوێندم و دواتر بەرەو هۆڵەندا کەوتمە ڕێ و لەوێ لەگەڵ خێزانێکی لوبنانی لە ڕۆتردام مامەوە. لە زانکۆ بەشی شانۆم تەواو کرد، دواتریش فێری ژەنینی کەمانچە بووم، پاشان ناسنامەی هۆڵەندیم وەرگرت.

– ئەی کەی هاتییە ئێرە؟

– سەرەتای مانگی شوباتی پێشوو.

– هاتی تا خۆتم پیا بکێشی!

– هاتم تا چارەنووسمان لە شەوێکی باراناویدا بە یەکدا بکێشی.

– ئەی چی دەکەی لە لەندەن؟

– ئەوە دەکەم کە پێم خۆشە، ئەوانە دەبینم کە خۆشم دەوێن.

– بیرت نەکردووەتەوە ڕۆژێ لە ڕۆژان بگەڕێیتەوە عێراق؟

– عێراق! کامە عێراق! عێراق دوای *ڕەسافی* و *بەیاتی* و *حەیدەری* و *سیاب* و *نازک* مرد. عێراقێک بوونی نەماوە هوزام، نەخێر، شتێک بە ناوی عێراقەوە نەماوە.

بیرم لەو ئافرەتە دەکردەوە کە بەدەم ئازارەوە دەتلێتەوە، خەفەت بۆ نیشتیمانێک دەخوات کە ڕوون بوو زۆر هەوڵی داوە لە بیری بکات. ولادە هەوڵی دەدا خۆی لە عێراق بەری بکات، چونکە ئەو خاکە نەیتوانی ئەم لە خۆ بگرێت و چیرۆکی عیشقەکەی ڕزگار بکات. بیرم لەوە دەکردەوە کە بیرتەسکی چیمان بەسەر دەهێنێت و چۆنچۆنی نیشتیمان لە بەرچاومان قێزەون دەکات، بێ ئەوەی نیشتیمانی داماو هیچی کردبێت، جگە لەوەی کۆمەڵێک مرۆڤی لە سنوورەکانیدا کۆ کردوونەتەوە کە هەر یەکەیان سەر بە بیروباوەڕ و تیرەیەکی جیاوازە. ئەم نیشتیمانە ناتوانێت وا لەم مرۆڤانە بکات بەیەکەوە بژین، وەک چۆن ناتوانێت لەگەڵیشیاندا دادپەروەر بێت.

ئەم دارخورما بڵندەش نەدەبوو دوور لە عێراقەکەیەوە ژیان بگوزەرێنێت، ئەم نازدارە دەبوو *ئینانای*[1] خانمەخوداوەند، یاخود

---

١. لە میزۆپۆتامیا خانمەخوداوەندی عیشق و جەنگ و فەڕ بووە. جیا لەمانە، تایبەتمەندییەکانی جوانی، سێکس، دادپەروەری و دەسەڵاتی سیاسیشی لە خۆ

شاژنی *شامیرام*[1] بێت. ئەم خانمە لێهاتووە، دەبوو مریەمی عێراق با و وەک چۆن ئەوکات ئەندەلووس بە ولادە دەناسرایەوە، عێراقیش بەم ولادەیە بناسرێتەوە.

گوتم: «گەر عێراق دەیزانی چ ولادەیەکی لە کیس چووە! عێراق تۆی لە دەست چوو ولادە، لە دەستی چوو!»

– عێراق باکی بەوانە نییە کە لە دەستیان دەدا هوزام! منیش چیتر عێراق بە نیشتیمانی خۆم نازانم. لە هەر جێیەک یەکسانی هەبوو، ئەوێ نیشتیمانی منە.

– دەزانی، هەمیشە باوەڕم وا بووە کە عێراق خاکی شارستانییەت و پێکەوەژیانە.

– ئەی یەکێ لە خەلیفەکانی ئێوە نالّێ کە خاکی دووڕوویی و پاشقولدانە!

---

گرتووە. سەرەتا سۆمەرییەکان بە ناوی ئینانانەوە بانگیان کردووە، بەڵام دواتر بابیلۆنی و ئەکەدییەکان ناوەکەی دەگۆڕن بۆ *عەشتار*. «و. ک»

1. سەمیرامیس، سیمورامات یاخود شامیرام: شاژنێکی ئاشوورییەکانە و ناوەکەی بە واتای کۆتر دێت. ئەفسانەی شامیرام دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێ ڕووباری فورات هەڵدەچێت و ماسییەکان هەمووی دەکەونەوە کەنار، لەنێو ئەم ماسیانەدا، دوو دانەی گەورە دەبینرێن. هێلکەیەکی گەورە بەسەر ڕووی ئاوەکەوە جێ دەهێڵن و دەڕۆن. دواتر کۆترێک دێت و هێلکەکە لەگەڵ خۆیدا دەبات، لەسەری دەنیشێت و ئاخری هێلکەکە دەترووکێت و منداڵێکی جوانکیلەی تێدا دەبێت. کۆترەکان بە مەبەستی بەخێوکردنی منداڵەکە، هەموو ڕۆژ دەچنە کێڵگەی جووتیارەکان و لەوێ نان و پەنیر دەدزن و دەیهێننەوە بۆ منداڵەکە. تا ڕۆژێکیان جووتیارەکان سەرنجی دیارنەمانی بەرهەمەکانیان دەدەن و ڕێک دەکەون کە بە وردی چاودێرییان بکەن، تا ڕۆژێک چاویان لە کۆترەکان دەبێت کە دێن و خۆراکەکە دەدزن. یەکێک لە جووتیارەکان ڕادەسپێرن شوێن کۆترەکان بکەوێت و ئاقیبەت جێگەی کۆترەکان و منداڵە جوانکیلەکە دەدۆزێتەوە. لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێتەوە و ناوی دەنێن شامیرام، دواتریش بڕیار دەدەن لە بازاڕی نەینەوادا بیفرۆشن. «و. ک»

– دەڵێن حەجاج[1] وای گوتووە و حەجاجیش مرۆڤێک نییە قسەی لێ وەرگیرێ!

بێدەنگ بوو، لێم پرسی:

– ئەی حەز ناکەی وردەکارییەکانی ژیانی من بزانی؟

هەستایەوە و گوتی: «بۆ کاتێکی تر هوزام، کاتێکی تر!»

دیار بوو ڕاستییەکان شەکەتیان کردبوو و وا پێویستی دەکرد ئەو شەوە بە تەنیا بێت، تا ئازاری ئەو ڕاستی و برینانەی ڕابردوو تێبپەڕێنێت کە بە ڕوونی دیار بوو چەندە جەرگبڕن! دەستم بە سەریدا هێنا، جا دەستیم گرت و تا لای دەرگەکەم برد.

سەریم ماچ کرد و پرسیم:

– کەی چاوم پێت دەکەوێتەوە؟

هەناسەی تەنگ بووبوو و گوتی:

– هەر کات چارەنووسەکانمان بە یەکیاندا دایەوە!

ورد دەبوومەوە و لە مانای ڕستەکەی تێدەفکریم. پێدەچوو نەیەوێ زیاتر بڵێت، زۆر شەکەت دیار بوو و وا پێویستی دەکرد بڕوات و سووچی دوورەپەرێزی بگرێتەوە. زیاترم لەگەڵ نەوت، دەستم بە سەریدا هێنا و گوتم: «چاوەڕێ دەبم!»

ولادە چووە دەر و منی هەر وا بە تەنیا لە بەربەرەکانێی شتێکدا کە لێی تێنەدەگەیشتم، جێ هێشت. خەمەکانم نیگەرانیان کردبووم، لێوڕێژ بووم لە بێهیوایی و خەونەکانم بە با چووبوون. هەر ئەو

1. ئەبو موحەممەد حەجاج بن یوسف سەقەفی: ڕابەرێکی ئومەوییەکان بووە، لە تائیف لە دایک بووە و هەر لەوێش گەورە بووە، بەڵام دواتر دەچێتە شام و لەوێ دەمێنێتەوە. «و. ک»

شەوە زانیم کە چەندە قورسە ڕابردوو لە زنجیرەی ژیان دابڕینین. ئەو زنجیرەی ژیانەی کە بە ڕابردوو دەست پێ دەکات، هەر دەبێت بە ئێستەدا تێبپەڕێت و بەو دواهەمین ساتەوەختە کۆتایی بێت کە بێ چەندوچوون دەبێت ئەزموونی بکەین. ڕابردوو ئەو پاشخانەیە کە وێنەی ئێستە و سیماکانی داهاتوو دەنەخشێنێت. کەوایە بۆ پێمان وایە دەتوانین فەرامۆشی بکەین و بەردەوامی بە ڕێگەکەمان بدەین؟

ئەو ڕابردووەی کە تا گیانمان تێدایە بانگەشەی مردنی دەکەین، هەر بە زیندوویی دەمێنێتەوە. ڕابردوو نامرێت، نا، نامرێت! لەناوچوونی ڕابردوو جگە لە وەهمێک هیچی تر نییە و هەوڵ دەدەین بڕوای پێ بهێنین، چونکە دەمانەوێت ئەوانی تر لە هەڵەکانی ڕابردوومان خۆش ببن و خۆشمان بێ هیچ گلەیی و پرتەوبۆڵەیەک ژیان بگوزەرێنین.

ئێستە دەزانم کە پاشماوەکانی ڕابردوو گیانیان تەنیوم و هەرگیز نەمتوانیوە خۆمیان لێ دەرباز بکەم. بەڵکە لە ناخمدا زیاد و زیادتر و زیادتر کەڵەکە بوون، تا ئەوەی وەختە هەناسەم ببڕن! بەڵام ڕۆژێک پێشتر، هیچ لەمە تێنەگەیشتبووم، بەڵێ، قەت لێی تێنەگەیشتبووم!

پێم وا بوو کە خۆمم لە هەموو ئەو شتانە ڕاتەکاندووە کە بە خێزان و ئایین و نیشتیمانمەوە دەبەستنەوە، پێم وا بوو دەتوانم خۆم لە هەموو شتێک قوتار بکەم و لە خاڵی کۆتاییەوە دەست بە سەرەتایەکی نوێ بکەم، بێ ئەوەی هیچ شتێک بە دواهەمین خاڵی پێشووەوە بمبەستێتەوە. نەمدەزانی ژیان زنجیرێکی سێئەڵقەییە و کەوتنی ئەڵقەیەکیان هەرگیز ڕێی تێ ناچێت.

ئەمڕۆکە دەزانم کە سێخناخم لە ڕووداوەکانی پێشووتر و ڕێگەکان، گشت ڕێگەکان دەچنەوە سەر ئەو شوێنەی کە لێیەوە هاتم. ئێستە ئیدی دەزانم کە نیشتیمانەکان تەنیا قوربانی دەستی مرۆڤەکانن و ئەوە ئێمەین کە چاوەڕوانیی گەورەمان لێیان هەیە.

چاک دەزانم مرۆڤەکان مەستی دابونەریتی خێڵەکی و کۆنەپارێزانەن. ئەوە ئەوانن کە خەونەکانمان تەفرووتوونا دەکەن و دڵمان لە بێخەوە هەڵدەکێشن و لە ناخماندا تۆوی کینەیەکی ڕووت دەچێنن. هەر ئەم مرۆڤانەن وامان لێ دەکەن دەستبەرداری هەموو شت ببین و لە نیشتیمان هەڵبێین، هەر ئەوان ئەو وەهمەیان بۆ دروست کردین کە یاسا دەیانپارێزێت و ئایین چاوی لێیان دەبێت. وای لێ دێت سووچێکمان بۆ نامێنێتەوە و یان ئەوەتا دەبێت ملیان بۆ کەچ بکەین و وەک ئەوانمان لێ بێت، یان ئەوەتا پەنا بۆ نزیکترین نیشتیمان، یان داڵدە بەرین و هەوڵی لەبیرکردنی هەمووی بدەین.

ئێستە دەزانم کە هیچیم بیر نەچووەتەوە و هەرچەند چاویش بنووقێنم و بانگەشەی ئەوە بکەم هیچ شتێکی ڕابردووم نایەتەوە خەیاڵ، بەڵام هەرهەمووی وەک فیلمێک دێتەوە پێشچاوم. هەنووکە دەزانم کە گشت هەوڵەکانم بۆ سەرکوتکردنی ڕابردوو بێهوودە بوون، نە یادگەم پەکی کەوت، نە یادگارییەکانم سڕانەوە، نە ڕۆژێکیش توانیم خۆم لە داوی ئەو شتانە نەجات بدەم کە پێیاندا تێپەڕیم.

ئەمڕۆکە تێگەیشتووم کە هێشتاش دڵم لەتاو ئازار و ئەو هەموو خەم و تاڵاوە دەناڵێنێت و، ناشتوانم بگەڕێمەوە. هەرگیز تێنەگەیشتم کە بۆچی نیشتیمان ئەمەی بەسەر هێنام، چۆن هەموو ئارەزوو و خەونەکانی لێ سەندم. ئەوە نیشتیمان بوو کە نەیهێشت بەشێک بم لە پێشکەوتنی، دەستێکم لە بنیادنانیدا هەبێت و لە خاکەکەیدا بە خۆشەویستییەوە ژیانم بگوزەرێنم و هەر بە ئەڤینیشەوە تێیدا سەر بنێمەوە.

دەزانم کە ناتوانم بگەڕێمەوە، چونکە هیچ شتێک لەو نیشتیمانەدا چاوەڕوانیم ناکات و کەسیش خۆشی ناوێم، بەڵام بەشێک لە من پێویستیی پێیەتی، بەشێکی من سەرباری هەموو شت، هەر خۆشی دەوێت! کە ڕیازم جێ هێشت، بلیتی ڕۆیشتنی بێگەڕانەوەم بڕی، وام

دەزانی هەرگیز بیر لە گەڕانەوە ناکەمەوە، بەڵام ئێستە پێم وایە کە حەز دەکەم ڕۆژێک لە ڕۆژان بڕۆمەوە، تا چاوێک لە گردەکانی خۆشەویستی بکەمەوە، بچمەوە کاولاشی خەونەکانم و هەست بە لمی سەقامگیریم بکەم.

کە ئەوێم جێ هێشت، بڕیارم دا لەگەڵ بادا بڕۆم، ئەم بایەش منی بەرەو لەندەن هەڵپێچا. تێیدا لاپەڕەیەکی تازەم هەڵدایەوە و لە جیهانێکی تازەشدا ژیانم بەڕێ کرد. لەندەن فێری کردم پیاوێکی دڵڕەق و ساردوسڕ بم؛ پیاوێک کە ئاوڕ ناداتەوە. بەڵام هەموو ئەوەی کە جێم هێشتبوو، کتوپڕ لە بەردەممدا قوت بووەوە. بە بوێری پەیامبەرێکی نەبەزەوە بە ڕوومدا وەستایەوە، بیرکردنەوەکانم شێوان، هەستەکانم هەژان و کتوپڕ بێباوەڕیم ڕاتەکی!

کاتێک لە تاراوگەدا تووشی خەفەت دەبین، بە ڕادەیەک خەمەکانمان قووڵ دەبنەوە کە خەریکە بێنە دەنگ و هاوار بکەن. لە تاراوگەدا، نە کەسێک هەیە کۆمان بکاتەوە، نە کەسێکیش کە ئازارەکانمان لە باوەش بگرێت. لە هیچ مرۆڤێکی ئەوێ ناچین، تەنانەت گەر ڕیشیش بتاشین و قژمان دابێنین و بە شێوەزارێکی ساردوسڕی گەمژانەی ئینگلیزیش بدوێین.

ئەوان هەموویان لە یەک دەچن، ئەوە ئێمەین کە جیاوازین، ئێمەی بێگانەی ڕاکردوو لە برینەکانمان کە بەهۆی خەمێک، جەنگێک، عیشقێک، باوەڕێک، یاخود خێڵێکەوە لە نیشتیمانی خۆمان ئاوارە بووین.

لەوێ، وێڕای خۆشگوزەرانی و ئەو ترۆفیزەی کە لە هەموو جێیەک دەوری داوین، ئاسایی دەیگوزەرێنین، بەڵام شتێک وا دەکات بە کەممان بزانن، شتێک وایان لێ دەکات خۆیان لە ئێمە بە باشتر بزانن. جا با بە ئاشکراش ئەمە نەڵێن، وەلێ هەمیشە چاویان هاوار دەکات: *چۆنتان پێ خۆشە لە وڵاتەکەماندا بژین، ئازادیی خۆتان*

*وەرگرن، بەڵام ئەوە بزانن کە خۆشستان بکوژن، هەمیشە لە هەموو شتێکدا لە خوار ئێمەوەن.*

هەرچەند تێکەڵیشیان بین، هەر بێگانەین. هەرچەند هەڵسوکەوتیشمان وەک هی ئەوان بێ، چەنێکیش هەوڵی لاساییکردنەوەیان بدەین و، تەنانەت گەر ناسنامەی ئەویشمان پێ بدرێت، هەر غەوارەین. ئیدی بەم شێوەیە بێ ئەوەی هیچ وابەستەییەکمان بۆ ئەو نیشتیمانە هەبێت کە تێیدا دەژیین و ئەوەش کە تێیدا لە دایک بووین، گیر دەخۆین. چی لەوە ناخۆشتر کە وابەستەی هیچ جێیەک نەبێت!

بۆ شەوەکەی هەستم کرد دەستێک خراوەتە سەر بینەقاقام و لە بەردەم شەپۆلی خەمێکی کاریدا ڕووت بوومەتەوە. هەستم کرد هێشتاش لە هەمان ئەو شوێنەدام کە پێش دوو دەیە هاتمە لەندەن و تێیدا وەستابووم، هەستم کرد بەقەد مێروویەک نەجووڵاوم و وێڕای شکۆداریم، کەچی هیچ دەستکەوتێکم نییە.

ساتێک هەیە تێیدا شتێک بە ناوی شکۆوە نامێنێتەوە و هەمووی دەبێتە درووشم و قسە و پیاهەڵدان. ڕۆژە خۆشەکان هاتن و تێپەڕین و بڕانەوە! شکۆ تا ئەبەد نامێنێتەوە، مەستییەکەی دوای ماوەیەک دەڕەوێتەوە و ئیدی ئەسڵەن هەست بە بوونی ناکەین.

هەموو شەوێ کە خەڵاتێکم لە وڵاتێکی عەرەبییەوە بۆ دەهات، شاگەشکە دەبووم، بەڵێ، ئەوە من بووم کە لەتاو جۆشوخرۆشی شادی خەو نەدەچووە چاوانم و هەمیشە بڕوام وا بوو کە ڕۆمانەکانم منداڵی منن، هەڵگری ناوی منن و شانازییەکەیان بە نەمری دەمهێڵێتەوە، بەڵام ئێستە هەست دەکەم تەنیا کۆمەڵێک کاغەزن و کات سەرنگومیان دەکات، ڕۆژێ لە بڵاوکردنەوەیان دەوەستن و دواتریش خەڵکی بە تەواوی لە بیریان دەکات.

ئێستە ئیدی چاک دەزانم کە شتێکم لە ژیاندا نەکرد شایەنی ستایش بێت، لە جیهانێکی ساردوسڕدا بە تەنیا دەژیم و بەم نزیکانە لێوڕێژ لە غەریبی، لە باوەشی تەنیایی و پڕاوپڕ لە پەژارە و خەفەت و ڕۆژەڕەشی سەر دەنێمەوە.

کە لەسەر جێگەکەم ڕاکشام، ڕوخسار و ناو و شوێنەکان لە یادگەمدا کەوتنە سەما. سیمای بیست ساڵ لەمەوبەری باوکم کە ئێستە پیر بووە، ڕوخساری براکانم کە گەنج بوون، *هوشام* و *ڕیاز* و بەزید، خەندەی خوشکەکانم، *سارا* و *نەجلا* و نوورە کە ئێستە ڕەنگە منداڵەکانیان کوڕ و کچی لاو بن، دایکم کە هەر وا جێی هێشتم تا بە تەنیا شەڕی مرۆڤ و دابونەریت و خەم و تەنیاییم بکەم.

مامە *فەهدیی* بەدمەستم بیر هاتەوە، خاڵۆژنە *موزییەی* دڵڕەقم، داپیرە دڵپاکە کوێرەکەم. خانووە کۆنەکەمانم لە گەڕەکی *مەلەز*، کێڵگە پان و بەرینەکەی پارێزگای حری*ملامان*، دوکانەکەی باوکم کە دەکەوتە حەزرەمی و لەسەر شۆستەی جادەیەک بوو. ڕاڕەوەکانی زانکۆی *مەلیک سعوود*، قوتابخانەی *ئیبن ئەبی* یەزنی ناوەندی، بازاڕی عەویس و *مەلیک فەهدیی* مامۆستام.

ئەحمەدی هاوڕێمم بیر کەوتەوە، *سەعید* کە کوڕی دراوسێکەمان بوو، «تیپ»ـــەکەی دووگوڵیمان، مزگەوتی *قەریب*، خەستەخانەی شومەیسی و خێوەتگەکەی ڕێگەی *قەسیم*.

*لەیلام* هاتەوە بیر و گریام!

گریام و گریام و گریام. جگە لەو چەند جارە کەمەی کە گۆرانییەکەی *بیتلز* گریاندوومی، بیرم نایەتەوە گریابم. هەست دەکەم لەوەتەی پێم ناوەتە لەندەن، فرمێسکەکانم کەمیان کردووە، وەک بڵێیت سەرمایەک فرمێسکی چاوانمی وشک کردبێت. چەندان ساڵم بێ گریان بەڕێ کرد! کە ڕیازم جێ هێشت، لەناو فڕۆکەکە وەک منداڵ دابوومە

پرمەی گریـان، بە درێژایی گەشـــتەکە گریـام، تـا هەســـتم کرد فرمێسکەکانم وشکیان کردووە. هەرچەند فرمێسکەکانم، تەنانەت گەر دەریایەکیش بوونایە، هەر فریای ئەو چەرمەســـەرییە نەدەکەوتن کە لەو کاتەدا هەستم پێ دەکرد.

هێشـــتاش بیرمە کە چۆن گەشـــتیارەکان لێیان دەڕوانیم و تاو نا تاوێ ئاوڕیان دەدایەوە، چۆن لەنێو خۆیاندا دەیانچپاند و بە چاو ئاماژەیان پێ دەدام و چۆنییش بە بەزەیی و ســـەرسامییەوە نیگایان دەکردم. بیریـان لەو هۆکـارانە دەکردەوە کە گەنجێکی لاوی وایـان خســـتووەتە ســـەر قوڵپی گریان، گەنجێک کە لە فڕۆکەدایە و بەرەو لەنـدەن کەوتووەتە ڕێ، ئەو لەنـدەنەی کە ئەوکـات بەهەشـــت و گەورەترین خەونی گەنجان بوو.

ئەوە درێژترین گەشـــتی تەمەنم بوو. دوای ئەو گەشـــتە، هەموو جیهان گەڕام و سەدان کاتژمێرم لە فڕۆکەدا بەسەر برد، بەڵام هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان گەشـتێکی وا درێژم ئەزموون نەکرد، ئەو گەشـتەی کە هەســـتم کرد لە جیهانێکەوە دەگوازرێمەوە بۆ دانەیەکی تر، ئەو گەشتەی کە لە هیچ گەشتێکی تر نەدەچوو، گەشتێک کە تێیدا کۆتاییم هات و سەرلەنوێ دەستم پێ کردەوە.

نـازانم ئەو شـــەوە ولادە چ خەمێکی لە مندا چاند. نـازانم چۆن ڕاستیی ژیانی ئەوانی تر، وامان لێ دەکات ڕووبەڕووی ڕاستییەکانی خۆمـان ببینەوە. گشـــت ڕاســـتییەکان لە بەردەممـاندا والا دەبن و یـادگـاریی ئەو ڕووداوانەی کە ئەزموونمـان کردن و ئەوانەش کە خۆشـــەویســـت و کەســـانی ئازیزمان ئەزموونیان کردن، بریندارمان دەکەنەوە.

ئەو شەوە کە ولادە باسی دەرد و بەڵاکانی خۆیی کرد، وەک ئەوە بوو چنگێک خوێ بەســـەر برینەکەمدا بکات، هێندە ئازاری دام کە هەستم دەکرد خەریکە لەتاو ئازار گیانم دەردەچێت. هەستم بە ژەهری

ناسۆری کرد کە بە جەستەمدا تەشەنە دەکات، نە دەمتوانی لە کۆڵ خۆمی بکەمەوە، نە ئەوەش کە تیماری بکەم. تاکە چارەسەر ئەوە بوو خۆمی بۆ شل بکەم و لەتاو خەم و ئازاردا بمرم.

نازانم ئەو شــەوە چەندە گریام، بەڵام وەک ئەوەی ســەرینەکەم کیژێکی لاو بێت، باوەشم پێدا کرد و ئەوەندە گریام تا گریان مەستی کردم و خەو بردمییەوە. نازانم چەند ڕۆژ نووســتم! ڕەنگە دوو یان ســێ ڕۆژ. بەئاگا دەهاتم، دەچوومە ســەرئاو، ئاوم دەخواردەوە و دەگەڕامەوە جێگەکەم، جا زیاتر و زیاتر دەنووستم. هەڵدەستامەوە، دەچوومە تەوالێت، ئاوم دەخواردەوە و دەنووستمەوە. دەمویست لەو واقعە هەڵبێم کە لێی تێنەدەگەیشــتم، چونکە برینەکان کە وام دەزانی ئیتر سارێژ بوون، کەوتنەوە هەوکردن.

تەقەی توندی دەرگە بەئاگای هێنام و گوێم لە دەنگی جیهاد بوو کە لە ڕێی گەیشتنی بە گوێکانم، وەخت بوو خامۆش ببێت. کەمێک بە ئاستەم هەســتامەوە و هەســتم بە قورسیی ســەرم دەکرد. هێشتاش گریان بەری نەدابووم، چاوم ئاوســابوو، دەنگم نووســابوو، کاســەی سەرم پڕ بوو و حەوسەڵەی هیچم نەبوو.

بە ئەســپایی دەرگەم کردەوە و ڕوخســاری شــپرزەییم بینی. بە تووڕەبوونێکی دۆستانەوە گوتی:

– ئەیماڵت کاول بێ، ئاخر ئەمە کارە تۆ دەیکەی؟

باوەشم پێدا کرد و لەسەر قەنەفەکە دانیشتم. دەستی بۆ قوتووی جگەرەکانم درێژ کرد، توند ڕای کێشا و گوتی: «ئەوە چیتە هوزام! لە شــوقەکەت، لە داروبەرد بۆت گەڕام، دوایی بە خۆمم گوت، بە زیندوویی بێ یان مردوویی، هەر دەبێ لێرە بێ.»

زمــانم بەســترابوو، هەموو قســەکــان گیرابوونە قورگم و نەیاندەویســت بێنە دەر. دەســتم بە ناو قژمدا دەبرد، وەک بڵێیت

منداڵێک بم و پێویستم بە کەسێکی بەتەمەن بێت تا دەست بە سەرمدا بێنێت و ئەرخەیانم بکات. جیهاد دڵەڕاوکێی خۆی دەربڕی و فەرمانی کرد: «دەموچاوت بشۆ! کوپێ قاوەت بۆ ئامادە دەکەم.»

بەهۆی کەمخۆری و زۆر خەوییەوە، هەستم بە لاوازی دەکرد. هەستامەوە، دەموچاوم شت و گەڕامەوە لای جیهاد، هەمان ئەو شوێنەی کە کۆتا شەو لێی دانیشتبووین. لەوێ دانیشتبوو و دوو کوپ قاوەی لە بەردەم خۆیدا دانابوو. بۆنی عەترەکەی ولادە هێشتا نەڕەویبووەوە و شتێک لە ئەو، هێشتا ئامادەیی هەبوو. بەلام هەستێکی خراپ، بەرە بەرە دزەی دەکردە ناخمەوە. نازانم بۆ هەستم کرد دووبارە نایبینمەوە، هەستم بە ئامادەیی ئەو دەکرد کە لە ژوورەکە دەکشێتەوە و نایەوێت بمبینێتەوە. کەشێک کە دەتگوت هی پرسەیە، باڵی بەسەر شوێنەکەدا کێشابوو. هەستی شەشەمم هاواری بەسەر دەمار و هەستەوەرەکانمدا دەکرد کە نایەتەوە.

جیهاد لێی پرسیم: «بۆچی وەڵامم نادەیەوە! چەند جارێک تەلەفونم بۆ کردی و هەڵت نەگرت، کە زانیم مۆبایلەکەت داخراوە ترسام. چوومە شوقەکەت و لەوێ نەبووی، ئیتر وتم بە زیندووی بێ یان مردوویی، هەر دەبێ لێرە بتدۆزمەوە.»

– خەوتبووم! ڕەنگە مۆبایلەکەم شەحنی تیا نەمابێ بۆیە داخراوە.

– سێ ڕۆژە خەوتووی؟!

– کەم تا زۆر بەڵێ.

– بۆچی؟ چی بووە؟

هەستم کرد توانای مشتومڕم نییە و بۆ کۆتاییهێنان بە گفتوگۆکە، پێم گوت:

– هیچ نییە، نووسین شەکەتی کردبووم، هەر ئەوەندە.

جیهاد هەستی کرد پێویستم بەوەیە تەنیا بم، لەسەر کورسییەکەی هەستایەوە و گوتی:

– کێشە نییە، گرنگ ئەوەیە باشی. بەهەرحاڵ، بیرت نەچێ کە پێش ئێوارە، وتارەکەتم بۆ بنێری.

سەرم لەقاند. لە گیرفانی پاڵتۆکەیدا بلیتێک و بڵاوکراوەیەکی دەرهێنا و فڕێی دایە سەر مێزەکەی بەردەمم و گوتی:

– بەهەرحاڵ، دوو ڕۆژ پێش ئێستە تەلەفۆنم کرد تا لەگەڵ مادلین بانگهێشتی ئاهەنگێکی مۆسیقیت بکەین کە ئەوکات ساز دەدرا، بەڵام چێژی ئەو ئێوارەیە و بەسەربردنی کاتێکی خۆشت لەگەڵ ئێمە، لە دەست دا.

پێم گوت:

– حەوسەڵەی هیچ بۆنە و ئاهەنگێکم نییە جیهاد!

هەنگاوی بەرەو دەرگەی دەرەوە هەڵگرت و گوتی:

– بە دڵی خۆت! بەس وتارەکەت بیر نەچێ.

کە جیهاد ڕۆیشت، ویستم بخەومەوە، بەڵام دەمزانی کە گەر بەم جۆرە بەردەوام بم دەمرم. هەوڵم دا سەرنجم لەسەر هەستەکانی ئێستەم نەبێت و بە هیچ جۆرێک خۆم بۆ خەو بە دەستەوە نەدەم. ژەمێکم ئامادە کرد و بە ئاستەم پێم خورا. جلێکی کەشخەم پۆشی، بڵاوکراوەی ئاهەنگە مۆسیقییەکە و دەستنووسی ڕۆمانە تەواونەکراوە بێکۆتاکەمم هەڵگرت و چوومە دەرەوە تا بەشوێن ژیاندا بگەڕێم.

هەوڵم دەدا بیرکردنەوە نەرێنییەکانم کە تا دەهات زیاتر کەڵەکە دەبوون، لە مێشکم وەدەر بنێم. چوومە دەرەوە و بێ مەبەست هەر وا شەقامەکانم تەی دەکرد و ڕوخسارگەلێکم دەدی کە لەتاو سەرما و بێباکی، شین داگەڕابوون! هەر وا بێ ئامانج ڕێم دەکرد و سەرما و پەژارە، تووشی کۆکەیان کردبووم. شتێک لە لەندەمدا هاواری دەکرد، بە دەست ئاماژەی بۆ دەکردم و بە ڕوومدا دەیقیژاند: «تۆ شکستخواردووی!»

ئێستە باش دەزانم کە شکستخواردووم، چونکە بە چی دەچێت سەرکەوتنێکی کردەیی تۆمار بکەین و شکۆیەکی ئەدەبیمان هەبێت لە کاتێکدا هیچ دەستکەوتێکی سۆزداریمان نەبێت! شکۆ و ناوبانگ کەڵکی چییان هەیە کە تۆ دڵخۆش نەبیت! ئەو دڵخۆشییەی کە تەنیا بە سەقامگیری دێتە دی، سەقامگیرییەک کە تەنیا کاتێک پێی دەگەین کە هەست و سۆزمان هەبێت، سۆزێک کە سەرچاوەکەی خێزانە، یاخود سۆزێک کە دەبێتە سەرچاوەی دروستکردنی خێزان. منیش لە هەموو شتێکدا سەر کەوتم، تەنیا لایەنە سۆزدارییەکەم نەبێت. پێم وا نییە ڕۆژێک لە ڕۆژانیش بتوانم خێزانێک پێکەوە بنێم.

ڕێگەکانی لەندەنم دەپێوان و بەشوێن ڕوخسارگەلێکدا دەگەڕام سەرسامم بکەن. عەوداڵی ئەوانە بووم کە لە خۆم دەچن، بەڵام خۆ ڕوونە کە ڕوخسارە لێکچووەکان، لە یەکتری ڕادەکەن. کەوایە چۆن بەشوێن کەسێکدا بگەڕێم کە لێم ڕادەکات و خۆیشم هەمیشە لێیان ڕام کردووە؟

لەو قاوەخانەیە دانیشتم کە تێیدا چاوم بە ولادە دەکەوت. بۆ ئەوەی ڕۆمانەکەم تەواو بکەم، هەوڵم دەدا خەمەکانم کۆ بکەمەوە. بەڵام تەنیا و تەنیا ولادە لە مێشکمدا بوو. سەرباری دواهەمین بەڵێنی تەمومژاویی، هەستم دەکرد هەرگیز چاوم پێی ناکەوێتەوە، قەت نایبینمەوە. من پیاوێکم کە هەستی شەشەمی بەسەر هەموو هەستەکانی تریدا زاڵە. پیاوێک کە دەتوانێت سۆسەی هەموو ئەو ناخۆشیانە بکات کە دێنە ڕێی، یەک بە یەکی ئەو کارەساتانەی کە لێی دەقەومێن و دانە دانەی ئەو کۆتاییانەی کە لێی نزیک دەبنەوە. پیاوێکە ئاینوئۆینی ئافرەتان ئاشنایە، دەزانێت کەی لەگەڵیدا دەست پێ دەکەن، کەی جێی دەهێڵن و کەیش بە تەواوی ماڵاوایی لی دەکەن.

دابڕان تاڵە، ئێجگار تاڵ! ئافرەتان وا دەزانن پیاوان زوو شتەکان لەبیر دەکەن و بۆ تێپەڕاندنی پەیوەندییە شکستخواردووەکەیان، پێویستیان بە هیچ نییە. نازانن پیاو کە عاشقی ئافرەتێک بوو، دەبێتە

خەون و خۆراکی! ئافرەتان تێناگەن کە عیشـــقی ڕاســتەقینەی پیاو، لەبیر ناکرێت.

پێم وا نەبوو عیشـــقی ژیانم بەو شـێوازە دراماتیکییە بەسـوێیە بەرۆکم بگرێت. عیشـــقێک کە ســــەرباری گەرموگوڕییەکەی، کەچی ئامادەییەکەی لە هات و نەهاتدایە. ســـەرباری قووڵییەکەی، کەچی ڕاستییەکانی شـــاراوەن. عیشـــقێک کە ســـەراپای داگرتم و ئاوا بە دڵشکاوی جێی هێشـتم. عیشـقێک کە تەمومژاوی دەستی پێ کرد و لەگەڵ ڕوونبوونەوەیدا کۆتایی هات.

هەوڵم دا دەست بە نووسینی وتارەکەم بکەم، هەوڵم دا بنووسـم. یان ڕۆمانەکەم تەواو بکەم، بەڵام یەک وشـەشـم پێ نەنووسـرا. کە بڵاوکراوەی ئـاهەنگە مۆسـیقییەکەم بە دەســـتەوە گرت، وێنەکەی ئەندرێ ڕیۆ و ولادە کە عەزییەکی درێژی پۆشـــیبوو و نایەکی بە دەســتەوە بوو، شـــاگەشـکەی کردم. پرچی ڕەشـی بە شـێوەیەکی خەفەتباری ســـەرســـووڕهێن، ڕووی بڵاوکراوەی داگیر کردبوو. لەسـەری نووسـرابوو: ئەندرێ ڕیۆی هونەرمەندی هۆڵەندی و ولادە ڕافدی هـاوکـاری لە دواهەمین ڕۆژەکـانی جەژنـدا، بە ئـاهەنگێکی مۆسیقی ماڵئاوایی لە لەندەن دەکەن.

لەو کاتەدا هەسـتم بە هیچ نەدەکرد، چونکە بە مێشکی کێدا دەهات ئەوەندە لە دواهەمین بینینییەوە نزیک بم! ڕووی ڕاستەقینەی ببینم! لە بەردەم کەسـێکدا کە خۆشـی دەوێ، ئەو کارە دەکات کە عاشـقیەتی. لەگەڵ کێش؟ ئەنـدرێ ڕیۆ! ئەقڵم نەیـدەگرت کە تـا چ ڕادەیەک چارەنووس دەکرێت قەشمەریمان پێ بکات، تا چ ڕادەیەک ئەو شتەی لێمانەوە نزیکە، دەکرێت دوور بێت؟

ئەلەو ســـاتەدا، هەســـتم کرد ئیتر نایبینمەوە. ئەو پێکدادانەش کە وەک ئاواتێک خستییە دڵمەوە، قەت ڕوو ناداتەوە. لەو ساتەدا هەستم کرد بەفرانبار خەریکە دەمخنکێنێت، نازانم بۆچی بەفرانبار هێندە حەز بە ئازاردانم دەکات.

ئای خوایە شەوانی سیویەکی مانگ چەندە ئەشکەنجەم دەدەن، وەک زیناکارێک بە شەلاقی چاوەڕوانی تیم بەر دەبن. دەنگی دەهۆلی ترس و تۆق لە دڵمدا بەرز دەبێتەوە، چەشنی پێشوازییەکی بەجۆشوخرۆشی شێتانەی قەرەجەکان کە کەس لێی تێنەگا!

من نکوولّی لەوە ناکەم کە مەزاجیم، بەڵام مانگی بەفرانبار لە سەرووی هەموو شتێکمەوەیە. گومانی تێدا نییە کە بەفرانبار مانگێکی زاڵە، بەسام و کاریگەر و دەسەڵاتدارە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا تێناگەم کە بۆ خەونەکان لە بەفرانباردا کۆتاییان دێت!

هاوڕێیەکم کە هەموو شتێک دەفەلسەفێنێت، گوتی خەونەکان لە بەفرانباردا کۆتاییان دێت، چونکە گرنگترین خەونی منی تێدا نێژرا. گوتی کە هەندێک لە شکستەکانمان، لە قووڵایی ناخمانەوە بە شێوەیەکی خۆبەخۆ بە وەرز یاخود ئەو مانگەوە دەبەسترێنەوە کە تێیدا لە دەستی دەدەین. دواتر ئەم وەرز، یاخود مانگە، هەموو ساڵێک بۆ ئێمە دەبێتە وەرزی لەدەستدان، چونکە تێیدا یادگارییەکانمان لە نائاگاییماندا دەناڵێنن و دواتریش بە خەم و پەژارەیەکەوە کە نازانین هۆکارەکەی چییە، ڕۆژەکان دەگوزەرێنین.

هەموو ساڵێک لەو مانگەدا کە لای خەڵکی مانگی بۆنەکانە، خۆم دوور دەگرم. لە بەفرانباردا هەموو مرۆڤەکانی سەرانسەری جیهان، جەژن لە دوای جەژن دەگێڕن، لە مانگێکدا کە بە ڕووکەش درەوشاوە و سەرسوورهێنە، بەڵام لە ناواخنی بەفرانباردا، خەم و شکستەکانی خەڵکی خۆیان حەشار داوە.

دڵمان بە یارییە ئاگرینەکان خۆش دەکەین کە لە هەموو جێیەک دەکرێن، دەمانەوێت بڕوا بکەین کە بابانوێل خۆشی و شادی لە دڵی نەوجەواناندا بڵاو دەکاتەوە. هەوڵ دەدەین چێژ لەو مۆسیقا شادانە ببینین کە لێرە و لەوێ بەر گوێمان دەکەون، لەگەڵ قاقا و سەما و ئاواتەکان!

بەڵام گشـتی درۆودەلەسـەیە. ئەم شـتانە، جگە لە منداڵان، دڵی کەسـی تر خۆش ناکەن. بەڵام ئێمە، بە چاوانێکەوە کە لەتاو ترسـی فرتوفێڵەکانی ئەو مانگە وەختە نەترووسـکێن، چاودێریی بەفرانبار دەکەین.

دڵتەنگی لەوەدا بوو هەناسـەم لە بەر ببڕێت. هەر بەو جۆرەی کە هەموو شت خۆی لە کۆڵ من کردەوە، دەمویست هەموو شت لە کۆڵ خۆم بکەمەوە. قاوەخانەکەم جێ هێشـت و بەرەو ماڵ ملم نا، کلکی شـکسـت و شـەرمەزاریم بەشـوێن خۆمدا کێش دەکرد. لە ڕێگەدا، ئافرەتێکم دی کە لەسـەر شۆسـتەکە کەمانچەی لێ دەدا، وەسـتام تا گوێ لە ئاوازەکانی بگرم و لەو کاتەدا بیرم لە ولادە دەکردەوە کە خەمەکانی خۆیی ژەندن و ڕۆیی، بێ ئەوەی گوێ لە ناڵەی ئازارەکانی من بگرێت و دەرفەتی ماڵئاواییکردنم بداتێ.

ئەم جۆرە ڕۆیشتنییەیم پێ هەزم نەدەکرا، هەستم دەکرد بۆ ئەوە هات تا هەموو خەم و ئازارەکانی یادگەم تازە بکاتەوە. وەک ئەوەی بەس بۆ ئەوە هاتبێت بریندارم بکات و دواتریش بڕوات. هاتنەکەی چەندە شیرین بوو، ڕۆیشتنەکەشی هێندە تاڵ.

ولادە ئاسـایی نەبوو، لەخۆبایی، کەللەڕەق و خۆبەزلزان بوو، لە خودشەیداییدا نەرسیسیشی پێ نەدەگەیشت. بەڵام لە زۆر ڕووەوە لە من دەچوو. ئەو چوار پێویسـتییە پیرۆزەی منی تێر دەکرد کە هیچ ئافرەتێکی تر نەیدەتوانی تێریان بکات.

من پیاوێکم بەر لە هەر شـتێک، ئەقڵی پیرۆز ڕادەگرم، جا ڕۆح و دڵ و جەستەی. پیاوێک کە پێویستی بە ئافرەتێکە ڕێزی پیرۆزییەکانی بگرێت، خۆشـی بوێن و پڕیان بکاتەوە، ئەویش خاوەن کۆمەڵێک پیرۆزی بێت کە هیچیان لەوانەی من کەمتر نەبێت. دڵنیای دڵنیام کە ئەم ئافرەتە جگە لە ولادە کەسی تر نییە.

وەلێ بەشوێنیدا ناگەڕێم.

لە خەفەتان دڵیشم بتەقێت هەر بەشوێنیدا ناگەڕێم. هەموو شتێک لەبەر هۆکارێک دەست پێ دەکات و لەبەر هۆکارێکیش کۆتایی دێت! ئێستە ئیدی دەزانم کە ئەم نێردراوە، هات تا پەیامێک بگەیەنێ و سرووشی گەڕانەوە لە ناخمدا سەوز بکاتەوە، بەڵام وێڕای باوەڕی تەواوم بە پەیامەکەی، شوێنی ناکەوم!

جزدانەکەمم لە گیرفانی پاڵتۆکە دەرهێنا و پاوەندەکەی ولادەم کە جەژنی پارساڵ پێی دابووم، بە دەستەوە گرت، جا بێ ئەوەی یەک تۆسقاڵیش پەشیمان بم، لەگەڵ دەستنووسی ڕۆمانەکە و بڵاوکراوەی ئاهەنگە مۆسیقییەکە و کاتژمێرەکەی دەستم کە لە پێش کاتی ئاسایی لەندەنەوە بوو، خستمە ناو سنووقی بەردەم ئافرەتە کەمانچەژەنەکەوە.

بەڵێ، لە بەفرانباردا هەموو خەونەکان کۆتاییان دێ!

**٢٠١٠/١٢/٢٥**

**ئەسیر عەبدوڵڵا نەشمی**

"خودایە، داوات لێ ناکەم کۆڵەکەم سووک بکەیت، بەڵکە داوا دەکەم پشتێکی بەهێزم پێ ببەخشیت."

**- گۆتە**



Scanned with CamScanner

ئەو ڕابردووەی کە تا گیانمان تێدایە بانگەشەی مردنی دەکەین، هەر بە زیندوویی دەمێنێتەوە. ڕابردوو نامرێت، نا، نامرێت! لەناوچوونی ڕابردوو جگە لە وەهمێك هیچی تر نییە و هەوڵ دەدەین بڕوای پێ بهێنین، چونکە دەمانەوێت ئەوانی تر لە هەڵەکانی ڕابردوومان خۆش ببن و خۆشمان بێ هیچ گلەیی و پرتەوبۆڵەیەك ژیان بگوزەرێنین



لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان
٠٧٥٠١٥٧١٨١٨ - ٠٧٧٣١٩٧٤٦٤٦

